حکومەتی هەرێمی کوردستان- عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# پرۆگرامی پەروەردەی وەرزشی

## بۆ پۆلی دوازدەهەمی ئامادەیی

ئامادەکردنی

لیژنەیەك لە وەزارەتی پەروەردە

چاپی چوارەم

٢٠١٥ زایینی- ٢٧١٥ کوردی- ١٤٣٦ کۆچی

# بــەشــی یــەکــەم
# یاساکانی تۆپی پێ

## پێشەکی

### سەرەتایەك سە بارەت بە یاری تۆپی پێ :

یاری تۆپی پێ بە یەکێك لە بەربلاوترین یاری لە جیهاندا دەژمێردرێت لەلایەن یاریزانان و تەماشاکەران و هاندەران بە مەزنترین یاری دێتە هەژمارکردن . ئەم یارییە توانیوویەتی هەموو سنوورەکان بشکێنێت و بۆ قولایی ناخ و هەست و خۆشەویستی و سۆزی جەماوەر بچێت ... خەڵکانێکی زۆر لە گەورە و بچووك و تەمەنە جیاجیاکان پێی سەرسام بوون و لە یانە و گۆرەپان و قوتابخانە و زانکۆکان ئەنجام دەدرێت .

مێژووی ئەم یارییە بۆ زیاتر لە ٢٥٠٠ ساڵ پێش زایین دەگەرێتەوە .. چینیە کۆنەکان لەو ساتانەدا ئەنجامیان داوە .. سەرکردە چینیەکان لە مەشقی سەربازەکانیان بۆ بەرز راگرتنی توانای جەستەیی سوودییان لێ بینیووە هەروەها بۆ مەشقی پلانەکانی هێرشبردن و بەرگری کردن تیایدا سوودمەندبوون ، پێش ٦٠٠ ساڵ پێش زایین یۆنانییەکان و ژاپۆنیەکان ئاشناییەتیان بە یاری تۆپی پێ هەبووە و ئەنجامیان داوە ... میسرییەکان و بابلیەکانیش بەر لە ٣٠٠ ساڵ پێش لە دایك بوونی مەسیح ئەم یارییەیان کردووە ، جگە لەمانەش هەندێك لە پاشماوەی شیعری سەردەمی تاریکی و جەهالەت ئاماژە بەوە دەکەن کە عەرەبەکانی سەردەمی کۆن ئەم یارییەیان کردووە .. پێشەنگی ئەنجامدانی ئەم یارییە زۆر نیشانەی پرسیاری لە سەرە و زۆرێك لە ولاتان خۆیان بە بنەچەی ئەنجامدانی ئەم یارییە دەزانن و شەرەفی خاوەندارییەکەی بۆ خۆیان هەژماردەکەن . بەلام ئەم یارییەی کە بە شێوازی ئێستاکە بەرێوە دەچێت لە ئینگلتەرا دەرکەوتووە ، قوتابیانی قوتابخانەکانی ئینگلیزی بە پێشەنگی ئەو کەسانە دەژمێردرێت کە لە ساڵی ١١٧٥ی زایینی ئەنجامیان داوە .. ئەم یارییە لە دیار کەوتن و بەربلاوبووندابوو.بەلام دواتر بە مەرسوومی پادشایانە بەهۆی چەند هۆکارێکی جیاجیا قەدەغەکرا تەنانەت گەیشتە حاڵەتی سزادان بۆ ئەوانەی ئەم یارییە ئەنجام دەدەن بە بەندکردنیان بۆ ماوەی هەفتەیەك .

لە ساڵی ١٨٦٢ ئەدوارد ترنج (١٠) خاڵی دانا کە بەهۆیەوە یەکەم یاسایی نووسراوی یاری تۆپی پێ هاتەکایەوە هەرچەندە زۆر گۆرانکاری لەسەر یاساکان بەسەریدا تێپەری بەلام بنچینەی سەرەکی یارییەکە تا ئەم ساتە ماوەتەوە. لە ٢٦ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٨٦٣ یەکەم یەکێتی بۆ یاری تۆپی پێ لە جیهان دامەزرا کە ئەویش یەکێتی تۆپی پێ ی ئینگلیزی بوو .. دواتر لە ٢١ی مایسی ١٩٠٤ لە شاری پاریسی پایتەختی ولاتی فەرەنسا یەکێتی تۆپی پێ نێو دەوڵەتی هاتە دامەزراندن لە دوای کۆتایی هاتنی یارییەکانی ئۆلۆمپیادی ساڵی ١٩٢٨ پێشنیارێك بۆ ئەنجامدانی کۆتاییەکانی جامی جیهانی وەکو پاڵەوانیەتیەکی سەربەخۆ دەرچوو... کە لە یارییەکانی ئۆلۆمپیاددا بەرێوە بچێت .. هەروەها جامێکی زێرینی بۆ دانرا بە نێوی جۆلیەریمێ ناوەزدکرا ئەویش وەکو رێز لێنانێك بوو بۆ ئەو پیاوەی پاڵەوانیەتەکەی دروست کرد.ئەم یارییە لە ساڵانی نێوان ١٩١٢ تا ١٩١٥ لە رێگای ئەو قوتابیانەی لە تورکیاوە بۆ عێراق دەگەرانەوە هاتە نێو گۆرەپانی یاریگاکانەوە .. بە تایبەت ئەو قوتابیانەی خوێندنیان تەواودەکرد.. بە گوێرەی سەرچاوەکان یەکەم یاری تۆپی پێ ساڵی ١٩١٨ لە بەغدا دا بەرێوەچوو یانەی چەوییە بە کۆنترین یانە کە یاری تۆپی پێی تیادا ئەنجام درابێت دەژمێردرێت و لەساڵی ١٩٤٥ تیپی تۆپێ پێ ی یانەکە هاتۆتە دامەزراندن ... لە ١٩٤٨/١٠/٨ بەبەشداربوونی نوێنەری (١٤) یانەکە نوێنەرایەتی یانە ومرزشیەکانیان دەکرد بە فەرمی یەکێتی ناوەندی تۆپی پێ ی عێرق هاتە دامەزراندن لە هەرێمی کوردستانیش وەکو هەموو ناوچەکانی دیکەی عێراق .. یاری تۆپی پێ هەر لە سەرەتاکانی سەدەی رابردوو هاتۆتە ئەنجامدان و لەگەڵ گەرانەوەی قوتابیانی کورد لە ولاتی تورکیاوە بۆ کوردستان رێساکانی ئەم یارییە لە شارەکانی کوردستان بەربلاوبووە و لە قوتابخانەکاندا یاری تۆپی پێ بەرێوە چووە ، هەر بۆ ئەم مەبەستەش چەند گۆرەپانێك بۆ بەرێوەچوونی یاری تۆپی پێ تەرخانکراوە .

# بەندەکانی یاساى تۆپی پێ
# The Law of the Game

**یاسای یەکەم / یاریگا (میدان اللعب) The Field of play:-**

**ڕووکەشی یاریگا/ Field surface**

دەتوانرێت یاری لەو یاریگایانە ئەنجام بدرێت کە چیمەنی سروشتی یان دەستکرد بێت ، بە مەرجێك بە پێی یاسای تۆپی پێ ی نێو دەوڵەتی بێت ، دەبێت یاریگا لە شێوەی لاکێشەیی بێت درێژیەکەی پێویستە لە پانییەکەی زیاتر بێت.

**١- پێوەرەکان (الابعاد) Dimensions:-**

درێژی ٩٠–١٢٠ م بەرامبەر ١٠٠–١٣٠ یاردە.

پانی ٤٥–٩٠ م بەرامبەر ٥٠–١٠٠ یاردە.

**لە یارییەکانی نێو دەوڵەتی: International matches:-**

درێژی ١٠٠–١١٠ م بەرامبەر ١١٠–١٢٠ یاردە

پانی ٦٤–٧٥ م بەرامبەر ٧٠–٨٠ یاردە

**٢- نەخشەکێشان ( تخطیط میدان اللعب) Field Marking:-**

یاریگا بە هێڵی دیارو بەرچاو دیاری دەکرێت ، وە ئەو هێڵانەی کە ناوچەکان و گشت هێڵەکان دیاری دەکەن دەکەونە ناو ڕووبەری ناوچە دیاریکراوەکان، بە دوو هێڵە درێژەکە دەوترێت هێڵەکانی لاکان (خطي الجانب) بە دوو هێڵە کورتەکەش دەوترێت هێڵەکانی گۆڵ (خطي المرمی).

نابێ پانی گشت هێڵەکان لە (١٢) سم زیاتر بێت، وە یاریگا دابەشی دوو نیوەی یەکسان دەبێت بەهۆی هێڵی ناوەڕاستەوە، لە ناوەڕاستی یاریگادا بازنەیەك کە نیوە تیرەکەی (١٠) یاردەیە (٩,١٥) م بە دەوری هێڵی ناوەڕاستەوە دەکێشرێت.

**٣- ناوچەی گۆڵ (منطقة المرمی) The goal area:-**

هەردوو ناوچەی گۆڵ دیاری دەکرێت لە هەردوو کۆتایی یاریگا بەم شێوەیە:– دوو هێڵی ستوونی گۆشە وەستاو لە هێڵی گۆڵەوە بە دووری (٦) یاردە (٥,٥) م لە لێواری ناوەوەی هەردوو ئەستوونی گۆڵەوە دەکێشرێت ، ئەم دوو هێڵە بە دووری (٦) یاردە (٥,٥) م درێژ دەبنەوە بۆ ناو یاریگا ئینجا بە هێڵێکی ئاسۆیی ئەم هێڵانە تەریب بە هێڵی گۆڵ بەیەکەوە دەگەیەنرێت ئەو پانتاییەی بەم هێڵانەوە بە هێڵی گۆڵەوە سنوردار کراوە یان ئەو ڕووبەرەی بەم هێڵانە دیاریکراوە پێ ی دەگوترێ ناوچەی گۆڵ.

### ٤- ناوچەی سزا ( منطقة الجزاء ) The penalty area :-

ناوچەی سزا دیاری دەکرێت لە هەردوو کۆتایی یاریگا:

دوو هێڵی ستوونی بە شێوەی گۆشە وەستاو بەسەر هێڵی گۆڵەوە دەکێشرێ لە دووری (١٨) یاردە (١٦,٥) م وە ئەو هێلانەی درێژدەبنەوە بۆ ناو یاریگا بۆ ماوەی (١٨) یاردە پاشان بە هێڵێکی ئاسۆیی تەریب بە هێڵی گۆڵ بەیەکەوە دەگەیەنرێت وە ئەو رووبەرەی بەم هێلانە دیاریکراوە پێی دەگوترێ ناوچەی سزا لە ناوەوەی ناوچەی سزادا نیشانەیەك بە دووری (١٢) یاردە (١١) م لە ناوەڕاستی گۆڵەوە دیاری دەکرێت وە پێی دەگوترێ خاڵی سزا کەوانەیەك لە دەرەوەی ناوچەی سزادا بە دووری (١٠) یاردە (٩,١٥) م لە خاڵی سزاوە دەکێشرێت پێی دەگوترێ کەوانەی سزا.

### ٥- ئەستوونەکانی ئاڵای گۆشە ( الراية الركنية ) Flag posts :-

ئەستوونی ئاڵای گۆشە دادەنرێت لای هەر ناوچەیەکی گۆشە کە بەرزی کەمتر نەبێت لە (١,٥) م بە شێوەیەك ئاڵای هەڵگرتبێت و سەرەکەی تیژ نەبێت ، دەتوانرێت ئەستوونی ئاڵای هاوشێوەی ئەو دابنرێت لە کۆتاییەکانی هێڵی ناوەڕاست کە دووری کەمتر نەبێت لە (١) م لە دەرەوەی هێڵی تەنیشت.

### ٦- دوو گۆڵەکە ( المرميان ) Goals :-

هەردوو گۆڵەکە دەبێ لە ناوەڕاستی هێڵی گۆڵ دابنرێت ئەم دوو گۆڵەش پێویستە لە دوو ئەستوونی وەستاو پێك بێن و بە ماوەیەکی یەکسان لە هەردوو ئەستوونەکەی ئاڵای گۆشەکانەوە دووربن و لە سەرەوەش لە رێگەی راجەوە (عارضة) پێکەوە دەبەسترێتەوە دووری نێوان هەردوو ئەستوونەکە (٨) یاردە (٧,٣٢) م و بڵندی لە نێوان رۆخی ژێرەوەی راجە و زەوی دا (٢,٤٤) م یان (٨) پێ ، وە پانی و ئەستووری هەردوو ئەستوونەکەی گۆڵ و راجە (عارضة) دەبێ یەکسان بن ، نابێ لە (١٢) سم زیاتر بێ ، هەروەها هێڵەکانی گۆڵیش دەبێ هەمان پانی و ئەستووری ئەستوونەکانی گۆڵ و راجەکانی هەبێ ، دەتوانرێ تۆر بۆ هەردوو گۆڵەکە لەگەڵ زەوی بە دواوەی گۆڵەکان ببەسترێ و بە شێوەیەك نەبێتە رێگر لەبەردەم گۆڵچی ، پێویستە ئەستوونەکان و هەردوو راجە کە (عارضة) بە رەنگی سپی بۆیە بکرێت.



## ٧-كەوانەی ناوچەی گۆشە : The corner arc

چارەگە بازنەیەك وێنە دەكرێت كە نیوەتیرەكەی (١ م) (١ یاردە) لە ئەستوونی ئاڵاكانی گۆشە بۆ ناوەوەی یاریگا.






## پێوەری مەتری




## پێوەری یاردە ( بەریتانی )



## یاسی دووەم / تۆپ (الكرة) The Ball

### (تایبە تمەندی و پێوانەکان) Qualities and measurements:-

پێویستە تۆپەکە خڕبێت، وە لە پێستە یان هەر ماددەیەکی تری گونجاو دروست کرابێ ، پێویستە کێشەکەی لە (٤٥٠ گم)زیاتر نەبێت و لە (٤١٠گم) کەمتر نەبێت لە سەرەتای دەست پێکردنی یاری.

پێویستە چێوەی تۆپ لە نێوان(٦٨–٧٠) سم بێت.

پاڵەپەستۆی هەوا لەنێوان (٦٠٠–١,١٠٠) گم/سم٢ بێت لەسەر ئاستی دەریا.




## چۆنیەتی گۆرینی تۆپی دڕاو یان تەقیو لە کاتی یارییدا: Replacement of a Defective Ball

١– وەستاندنی یاری.

٢– دەست پێکردنەوەی یاری بە بەردانەوەی تۆپ لە شوێنی تەقینی.

- ئەگەر تۆپەکە دڕا یان تەقی لە کاتی لێدانی سەرەتای دەست پێکردنی یاری – لێدانی گۆڵ – لێدانی گۆشە – هەڵدانی لا – لێدانی ئازاد – لێدانی سزا ئەوا یارییەکە دووبارە دەست پێ دەکرێتەوە بە پێی شێوەی یاریەکە (وفقا للحالة).



## یاسای سێ یەم/ ژمارەی یاریزانان The number of players:-

### یاریزانەکان : Players

یاری لە نێوان دوو تیپ ئەنجام دەدرێت هەریەکێ لەو تیپانە نابێ ژمارەیان لە (١١) یاریزان زیاتر بێ و یەکێ گۆڵچی بێت ، ناتوانرێ یاری دەست پێبکات ئەگەر یەکێ لەو تیپانە ژمارەی یاریزانەکانی لە (٧) یاریزان کەمتر بێت.

## پاڵەوانێتیە فەرمیەکان (المسابقات الرسمية)/ Official Competitions

لە یارییە فەرمیەکان نابێت لە (٣) یاریزان زیاتر بگۆردرێت لە کاتی یاری دا بەلاّم بە پێی ڕێنماییەکانی خولەکە دەتوانرێت لە (٣) یاریزان تاکو (٧) یاریزان بگۆردرێت.

## چۆنیەتی گۆرینی یاریزان: Substitution Procedure

لەکاتی گۆرینی یاریزان دەبێ ڕەچاوی ئەم خالآنەی خوارەوە بکرێت.

١- پێش گۆرینی یاریزان دەبێ ناوبژیوان ئاگادار بکرێت.

٢- نابێ یاریزانی گۆراو بێتە ناو یاریگا ، تا یاریزانەکەی تر یاریگا بەجێ نەهێڵێ و ئینجا ناوبژیوان ئاماژەی هاتنە ژوورەوەی بۆ ئەدا.

٣- یاریزانی یەدەگ (احتياط) لەلای هێڵی ناوەڕاستەوە وە لەکاتی وەستاندنی یاری دا دێتە ژوورەوە.

٤- بە هاتنە ژوورەوەی یاریزانی یەدەگ بۆ ناو یاریگا ، جێ بەجێ کردنی گۆرین تەواو دەبێت.

٥- لەو کاتەدا شوێن گر دەبێتە یاریزان وە یاریزانی گۆڕاو خاسیەتی یاریزانێتی نامێنێ.

٦- ئەو یاریزانەی کە گۆراوە نابێ جارێکی تر لەم یارییە بەشداری بکاتەوە.

٧- گشت شوێن گرو گۆراوەکان لە ژێر فەرمایشت و دەسەلآتی ناوبژیوانن.

## چۆنیەتی گۆرینی گۆڵچی: Changing the Goalkeeper

دەشێ هەر یاریزانێك شوێنی گۆڵچی بگرێتەوە بە مەرجێ:

١- پێش گۆرین ناوبژیوان ئاگادار بکرێتەوە.

٢- لەکاتی وەستاندنی یاری دا گۆڕانەکە ئەنجام بدرێت.

## سەرپێچییەکان (سزاکان): Infringements/Sanctions

أ- ئەگەر یاریزانێك بێ ڕەزامەندی ناوبژیوان هاتە ناو یاریگا:

١- یارییەکە دەوەستێنرێت.

٢- یاریزانی گۆراو سزای ئاگادارکردنەوە کارتی زەرد وەردەگرێت و دەبێ یاریگا بەجێ بهێڵێت.

٣- لەو شوێنەی کە یارییەکەی تیا وەستێنرابوو یارییەکە دەست پێ دەکرێتەوە بە لێدانی ناڕاستەوخۆ بۆ تیپی بەرامبەر.

ب- ئەگەر یاریزانێك بێ ئاگاداری ناوبژیوان شوێنەکەی لەگەڵ گۆڵچی گۆری:

١- یارییەکە بەردەوام دەبێت.

٢- هەردوو یاریزانەکە سزای ئاگادارکردنەوە (کارتی زەرد) وەردەگرن لە یەکەم هەڵ کە تۆپەکە دەکەوێتە دەرەوەی یاری.

ج- لەکاتی ڕوودانی هەر سەرپێچیەکی تر لەم بوارانەدا یاریزانەکان بە کارتی زەرد ئاگادار دەکرێنەوە.

## دەست پێكردنەوەی یاری:

ئەگەر یارییەكە وەستێنرا لە لایەن ناوبژیوان بۆ ئاگاداركردنەوەی یاریزان (كارتی زەرد) یارییەكە دەست پێدەكاتەوە بە لێدانی ناراستەوخۆ بۆ تیپی بەرامبەر لە شوێنی وەستانی تۆپ كاتێ یاری تێدا وەستێنرا.

## یاریزانانەكان ویاریزانە جێگرەوەكانی كە دەردەكرێن: Players and Substitutes Sent Off

١- ئەو یاریزانەی پێش سەرەتای یاری كردن دەردەكرێن . دەتوانرێ یاریزانێكی تر كە ناوی لە لیستی تۆماری یاریزانەكان تۆمار كرابێت شوێنی بگرێتەوە.

٢- هەر یاریزانێكی شوێن گر كە ناوی لە لیست تۆمار كراوە پێش یان كاتی یاری كردن دەركرا ئەوا ناتوانرێ بگۆردرێت.




## یاسای چوارەم / كەل و پەلی یاریزانان(معدات الاعبين) Players equipment :-

### خۆپارێزی ( سەلامەتی ) Safety:

پێویستە یاریزان هیچ كەل و پەلێك بەكارنەهێنێ و یاخود لەبەر نەكات كە زیان بەخۆی و یاریزانێكی تر بگەیەنێ (گشت جۆرەكانی خشلێ دەگرێتەوە)



### كەل و پەلە بنچینەییەكان : Basic Equipment

یاریزان پێویستە ئەم كەل و پەلانەی خوارەوە بە زۆر بەكاربهێنێ.

١- فانیلە یان كراس.

٢- دەرپێ- شۆرت. پێویستە هەمان ڕەنگی شۆرتی سەرەوەی هەبێ.

٣- گۆرەوی.

٤- پارێزەر بۆ قاچەكان (پارێزەری قاچ).

٥- پێڵاوی یاری كردن.



### ئامرازەكانی پاراستنی هەردوو قاچ: Shinguards

١- پێویستە بە تەواوی بە گۆرەوی داپۆشرابێت.

٢- لەماددەیەكی گونجاو دروست كرابێت وەك (لاستیك ، پلاستیك) یان هەر ماددەیەكی تری هاوشێوە.

٣- بتوانێ پارێزگاری قاچەكانی یاریزان بكات.

## ڕەنگەکان : Colours

پێوستە هەردوو تیپ ڕەنگی جل و بەرگیان لە گەل یەکتری جیاواز بێت ، وە هەروەها لە گەل ناوبژیوان و یاریدەدەرەکانیشی .

گۆڵچی بەرگێك لەبەر دەکا کە جیاوازی هەبێت لەگەڵ بەرگی یاریزانەکان و ناوبژیوان و یاریدەدەرەکانی.



## سەرپێچییەکان (سزاکان) (المخالفات-العقوبات) Infringements/Sanctions

هەر سەرپێچییەك کە لەم بەندەدا هاتووە.

١- پێویست بە وەستاندنی یاری ناکا.

٢- ناوبژیوان بە یاریزانە سەرپێچیکارەکە رادەگەیەنێ کە لەدەرەوەی یاریگا کەل و پەلەکانی چاك بکاتەوە.

٣- یاریزانەکە لەگەڵ یەکەمین ساتی وەستاندنی یارییەکە یاریگا بەجێ دەهێڵێ یاخود ئەگەر توانی هەر لەو کاتە لە ناو یاریگا کەرەستەکەی خۆی ڕاست بکاتەوە.

٤- ئەگەر یاریزانێك بە مەبەستی چاك کردنەوەی کەرەستەکەی چووە دەرەوەی یاریگا. نابێ بێ ڕەزامەندی ناوبژیوان بۆ ناو یاریگا بگەرێتەوە.

٥- ناوبژیوان دڵنیا دەبێت لە ڕاست کردنەوەی کەل وپەلی یاریزانەکە ئینجا رێگای گەراندنەوەی بۆ ناو یاریگا پێ دەدات.

٦- تەنها تۆپ لە دەرەوەی یاریدا بێت ، ئەوکاتە یاریزان دەتوانێ بۆ ناو یاریگا بگەرێتەوە.

ئەگەر یاریزانێك بەهۆی ئەم سەرپێچی یە داوای لێ کرا یاریگا بەجێ بهێڵێت بەڵام بێ رەزامەندی ناوبژیوان بۆ ناو یاریگا گەڕایەوە:-

- یاریزانەکە ئاگادار دەکرێتەوە (بەبەرزکردنەوەی کارتی زەرد) یارییەکە دەست پێ دەکرێتەوە بەلێدانی سەربەستی ناراستەوخۆ لەو شوێنەی کە یارییەکەی تیا وەستێنرابوو بۆ تیپی بەرامبەر.
- هەموو کەل وپەلێکی یاریزانان لە لایەن ناوبژیوان دەپشکنرێت وە ئەو بڕیار دەدات کە ترسناك نیە، ئەوانەش کەل و پەلی پارێزەری نوێن وەك : بەستەری سەر، چاویلکەی چاو، پارێزەری ئانیشك و ئەژنۆ کە لە مادەیەکی نەرم و سوك دروست کراون وە مەترسیان نیە و رێگا دەدرێت بەکاربهێندرێن.



## یاسای پێنجەم / ناوبژیوان (الحكم) The referee :-

### دەسەلأتی ناوبژیوان: The Authority of the Referee

هەر یارییەك بەهۆی ناوبژیوانەوە بەڕێوە دەچێت كە دەسەلأتی تەواوی پێ سپێردراوە لە جێ بەجێ كردنی بەندەكانی یاسای تۆپی پێ ، بۆ ئەویارییەی كە بۆی دیاری دەكرێت.



### ئەرك و دەسەلأتەكانی :Powers and duties

١- بەندەكانی یاسای تۆپی پێ جێ بەجێ دەكات.

٢- بە هاوكاری دوو یاریدەدەرەكەی و ناوبژیوانی چوارەم یارییەكە بەڕێوە دەبەن.

٣- دڵنیا دەبێ لەوەی ئەو تۆپانەی بەكاردەهێنرێت بە گوێرەی برگە هاتووەكانە لە بەندی ژمارە (٢).

٤- دڵنیا دەبێ لەوەی كەوا كەل وپەلی بەكارهاتوو لەلایەن یاریزانانەوە بەگوێرەی برگە هاتووەكانە لە بەندی ژمارە (٤).

٥- دەبێتە كات گر و ڕووداوەكانی یاری تۆمار دەكات.

٦- یاری دەوەستێنێ بۆ ماوەیەكی كەم یان كۆتایی پێ دەهێنێ بەگوێرەی بۆچوونی بەهۆی هەر سەرپێچییەك لەیاسای یاری.

٧- یاری دەوەستێنێ بۆ ماوەیەكی كەم یان كۆتایی پێ دەهێنێ بەهۆی هەر جۆرە دەست تێوەردانێكی دەرەكی بە هەر شێوەیەك بێت.

٨- یاری دەوەستێنێ ئەگەربینی یاریزانێ ئازاری پێگەییوە كە پێویست دەكا بگوازرێتەوە دەرەوەی یاریگا.

٩- یارییەكە بەردەوام دەبێ تا تۆپەكە دەكەوێتە دەرەوەی یاری كاتێ بینی یاریزانێك ئازارێكی سووكی پێ گەییوە.

١٠- ئەو یاریزانەی بەهۆی خوێن بەربوون چووەتە دەرەوەی یاریگا ، تا ناوبژیوان دڵنیا نەبێ لە وەستاندنی خوێن بەربوونەكە ، ئەوا ڕێگا نادا بگەڕێتەوە ناو یاریگا.

١١- ئەگەر یاریزانێك سەرپێچی كردو لەو كاتەدا تیپی بەرامبەر هەلی بۆ رەخسا بوو ، ناوبژیوان ئاماژەی سوود بەخشین وبەردەوامی یارییەكە ئەدا ،بەلأم ئەگەر ناوبژیوان بینی سوود لەو هەلەیە وەرناگیرێ ، ئەوا سزای سەرپێچییە بنەرەتییەكە دەدات.

١٢- ئەگەر یاریزانێك لە یەك كات چەند سەرپێچییەكی لێ ڕوودا كامیان توند تر بوو ، سزای ئەویان دەدات.

١٣- ناوبژیوان دەتوانێ لەوكاتەی تۆپ لە دەرەوەی یاری كردن بێ ئەوكاتە سزای ئەو یاریزانانە بدات كە ئاگادار دەكرێنەوە یان دەردەكرێن واتە دەتوانێ پەلە لە سزادانی یاریزانانە نەكات.

١٤- كاری پێویست دژ بە كارگێرانی تیپ بكا ، ئەوانەی ناتوانن لە هەلس وكەوتی وەرزشیدا خۆ گر بن ، واتە كاری نابەجێیان لێ ڕوودەدات ، ناوبژیوان دەتوانێ لە ناو یاریگا و لە دەوروبەری یاریگا دەریان بكات.

١٥- ئەگەر ناوبژیوان ڕووداوێكی ناو یاری نەبینی ، ئەوا دەتوانێ ئامۆژگاری یاریدەدەرەكانی وەربگرێ.

١٦- دڵنیا دەبێت لە نەهاتنە ژوورەوەی هیچ كەسێكی مۆلەت پێ نەدراو بۆ ناو یاریگا.

١٧- پاش هەر وەستاندنێك یاری دەست پێ دەكاتەوە.

١٨- دوای تەواو بوونی یاری ناوبژیوان راپۆرتێك بۆ بەرپرسانی پەیوەندیدار بەرز دەكاتەوە هەرچی زانیارییەك پێش یان كاتی یاری یان دوایی یاری دەربارەی گشت رووداوەكانی ناو یاریگا لەم یارییەدا لە خۆ دەگرێت.

## بریارەكانی ناوبژیوان :

- بریارەكانی ناوبژوان كە پەیوەستە بە راستیەكان و رووداوەكانی ناو یاری ، وە گۆل تۆمار كرابێت یان تۆمار نەكرابێت وە ئەنجامی یاری بە كۆتایی دادەنرێت.
- ناوبژیوان دەتوانێ بریارەكەی خۆی بگۆرێ ، ئەگەر زانی بریارەكەی هەڵەیە وە دەتوانێ بریارەكەی خۆی بگۆرێ بە پێ ی ئامۆژگاری یان بریاری یاریدەدەرەكانی دوای ئەوەی دڵنیا دەبێت ، بە مەرجێك یارییەكە هێشتا دەستی پێ نەكردبێتەوە یان كۆتایی پێ نەهاتبێت.



چۆنیەتی جولانەوەی ناوبژیوان ویاریدەدەرەكانی لە كاتی یاری






## یاسای شەشەم / یاریدەدەرەکانی ناوبژیوان( الحكام المساعدون ) The assistant referees :-

### ئەرکەکان : Duties



دوویاریدەدەری ناوبژیوان دەست نیشان دەکرێن لە ژێر دەسەلآتی ناوبژیوان دەبن.

ئەرکەکانی یاریدەدەری ناوبژیوان : ئەرکەکانیان بریتیە لە دیاریکردنی :

١– کەی تۆپەکە بە تەواوی لە هێڵی یاریگا دەچێتە دەرەوە.

٢– کام تیپ هەقی (لێدانی گۆشە– لێدانی گۆڵ – هەڵدانی لا) ی هەیە.

٣– کەی یاریزان سزا دەدرێت لە کاتی ئامادەبوون لە شوێنی دزە (ئۆفسایدا).

٤– ئەو کاتەی داوا دەکرێت کە گۆڕانی یاریزان ئەنجام درێت.

٥– ئەو کاتەی هەر ڕووداوێکی بەد ڕەوشتی یان هەر ڕووداوێکی تر ڕوودەدات کە ناوبژیوانی یاری نەیبینیووە.

٦– لە کاتی ڕوودانی هەر سەرپێچیەك ئەگەر هاتوو هەردوو یاریدەدەری ناوبژیوان نزیکتربوون لە ڕووداوەکە (ئەمەش ئەو ڕووداوانە دەگرێتەوە کە لەناو ناوچەی سزادا ئەنجام دەدرێت).

٧– لە کاتی جێبەجێکردنی لێدانی سزادا ، ئەگەر گۆڵچی جوڵەی کرد بۆ پێشەوە پێش لێدانی تۆپەکە،یان پەڕینەوەی تۆپ لەسەر هێڵی گۆڵەکە.



## یارمەتی تر: Assistance

- ❖ هەروەها یارمەتی ناوبژیوانی یاری دەدەن بەپێ ی ئەو دەقەی کە لە بەندەکانی یاسی تۆپی پێدا هاتووە.وە بە شێوەیەکی تایبەتی دێنە ناو یاریگا بۆ هاوکاریکردن بۆ رێکخستنی ماوەی (۹,۱٥م)(۱۰یاردە).
- ❖ ئەگەر یاریدەدەری ناوبژیوان کارێکی نادروست یان رەوشتێکی نابەجێ ی لێ روودا ئەوا ناوبژیوانی یاری دەتوانی دەست هەڵبگرێت لە خزمەتەکانی وە راپۆرتێك لەم بارەیەوە بۆ لایەتی پەیوەندیدار بەرز دەکاتەوە.





گۆرانکاری



هەلدانی لا بۆ تیپی هێرشبەر



هەلدانی لا بۆ تیپی بەرگریکار



لێدانی گۆل



لێدانی گۆشە




هێماكانى ياريدەدەرى ناوبژيوان

## ياساى حەوتەم /ماوەى يارى (مدة المباراة) The duration of the match :-

### ماوەى يارى/Periods of play

ماوەى يارى دوو گێمى يەكسانە ، هەر گێمەى (٤٥) خولەكە. ئەگەر هەردوو تيپەكە و ناوبژيوان لەسەر كاتى تر رێك نەكەوتن ، ئەوا وەكو خۆى دەمێنێتەوە.

هەر رێككەوتنێك بۆ گۆرانى ماوەى گێمەكان (نموونە كورتكردنەوەى گێمەكان بۆ (٤٠) خولەك بەهۆى كەمى رووناكى) دەبێ پێش دەست پێ كردنى يارى رێك بكەون . پێويستە بەپێ ى ياساى ئەو خولە پيادە بكرێت.

### ماوەى پشووى نێوان گێمەكان : Half-time-interval



١- ياريزانەكان مافى خۆيانە لە نێوان گێمەكان پشوو بدەن.

٢- نابێ ماوەى پشوودان لە (١٥) خولەك زياتر بێت.

٣- دەبێ بەپێ ى دەقى ياساى ئەو خولە ماوەى پشوودان ديارى بكرێت.

٤- دەتوانرێ ماوەى پشوودان تەنها بە رەزامەندى ناوبژيوان بگۆردرێت.

### قەرەبووى كاتى بەفيرۆ چوو : Allowance for time lost

كاتى بەفيرۆ چوودەبێت قەرەبوو بكرێتەوە لەهەر گێمێك لە گێمەكانى ياريەكە لە رێگەى ئەم هۆكارانەوە:-



١-گۆرانى ياريزانەكان.

٢- هەڵسەنگاندنى ياريزانە ئازار پێ گەيشتووەكان.

٣- گواستنەوەى ياريزانە ئازار پێ گەيشتووەكان بۆ چارەسەركردن لە دەرەوەى ياريگادا.

٤- كاتى بەفيرۆ چوو.

٥– لەبەر هەر هۆیەکی تر.

دیاری کردنی ماوەی قەرەبوو کردنەکە بە گوێرەی خەملاندنی ناوبژیوان دەبێت.

### لێدانی سزا: Penalty Kick

دەبێت کاتی یاری درێژ بکرێتەوە بۆ جێ بەجێکردنی لێدانی سزا یا دووبارە لێدانەوەی لە کۆتایی هەردوو گێمی ئاسایی یان هەردوو گێمی زیادکراو تا لێدانی سزا کۆتایی دێت.

## یاسای هەشتەم / سەرەتاو دەست پێکردنی یاری( الابتداء و استئناف اللعب ) The start and restart of play

### ڕێنماییە سەرەتاییەکان: Preliminaries

بە ئەنجامدانی تیروپشك ئەنجامدەدرێت بەهۆی پارچە دراوێکی ئاسن ، ئەو تیپەی دەباتەوە بریار ئەدات بۆ کام گۆڵ لە گێمی یەکەم دا هێرش دەبا، تیپەکەی تر لێدانی سەرەتا جێ بەجێ دەکات ئەو تیپەی تیروپشکی بردۆتەوە لە گێمی دووەم دا لێدانی سەرەتا جێ بەجێ دەکات و تیپەکان شوێنی خۆیان دەگۆرن لەسەرەتای گێمی دووەمدا.

### لێدانی سەرەتا/ Kick-off

❖ لێدانی سەرەتا ڕێگایەکە بۆ دست پێکردن یان دووبارە دەست پێکردنەوەی یاری :–



- لە سەرەتای دەست پێکردنی یاری.
- دوای تۆمارکردنی گۆڵ.
- لە سەرەتای دەست پێکردنی هەر گێمێك لە گێمەکانی زیاد کراو ئەگەر جێ بەجێ کرا .

دەتوانرێت ڕاستەوخۆ گۆڵ لە لێدانی سەرەتا تۆمار بکرێت.

### ڕێنماییەکانی ( ڕێگاکانی جێ بەجێکردن ) : Procedure

١– گشت یاریزانەکان لە نیوەی یاریگای تایبەتی خۆیان دەبن.

٢– نابێت یاریزانانی تیپی بەرامبەر لە دووری کەمتر لە (١٠) یاردە بوەستن تاوەکو تۆپەکە دەکەوێتە یاریەوە.



٣– دەبێ تۆپەکە لە خاڵی ناوەڕاست و لەباری وەستاوی دا بێت.

٤– ناوبژیوان ئاماژە دەدات.

٥– تۆپ دەکەوێتە یاری کاتێك لێدەدرێت و دەجولێتەوە بۆ پێشەوە.

٦– نابێ هەمان یاریزان دووبارە یاری بە تۆپەکە بکاتەوە تا بەر یاریزانێکی تر نەکەوێت.

کاتێ تیپێك گۆڵ تۆمار دەکا تیپەکەی تر لێدانی سەرەتا جێ بەجێ دەکات.

## سەرپێچییەکان (سزا):- Infringements/Sanctions

ئەگەر جێ بەجێکەری لێدانی سەرەتا ، پێش ئەوەی تۆپەکە بەر یاریزانێکی تر بکەوێت دووبارە بەری بکەوێتەوە.

❖ لێدانی سەربەستی ناڕاستەوخۆ لەو شوێنەی کە سەرپێچی تیا کراوە بۆ تیپەکەی تر دەژمێردرێت.

دەربارەی هەر سەرپێچییەکی تر پەیوەست بە شێوازی جێ بەجێ کردنی لێدانی سەرەتا:-

لێدانەکە دووبارە دەکرێتەوە.

## یاسای نۆیەم /تۆپ لە یاری و لە دەرەوەی یاری( الكرة في اللعب و خارج اللعب ) The ball In and Out of play:-

### ❖ تۆپ لە دەرەوەی یاری: Ball Out of Play

تۆپ لە دەرەوەی یاری دا دەبێت ئەگەر هاتوو :

١- تۆپەکە بە تەواوی تێپەر بێت لەسەر هێڵی گۆڵ و تەنیشتەکان لەسەر زەوی یان لە هەوا دا.

٢- کاتێك ناوبژیوان یارییەکە دەوەستێنێ.

### ❖ تۆپ لە یارییدایە : Ball In Play

تۆپ لە یاریدا دەبێت لە گشت کاتەکان و لەگەڵ ئەم بارانەی خوارەوە دا ئەگەر:

١- تۆپەکە بەر ئەستوونەکان و راجە (عارضة) یان هەڵگری ئاڵای گۆشە کەوت و بۆ ناو یاریگا گەرایەوە.

٢- تۆپەکە بەر ناوبژیوان و دوو یاریدەدەرەکەی بکەوێت بە مەرجێ لە ناو یاریگا بن.



## یاسای دەیەم / ڕێگای تۆمارکردنی گۆڵ( طريقة تسجيل الهدف ) The method of scoring:-

### گۆڵ ژماردن: Goal scored

گۆڵ دەژمێردرێت لەو کاتەی تۆپەکە بە تەواوی قەبارەیەوە لەسەر هێڵی گۆڵی نێوان هەردوو ئەستوونەکان ولە ژێر ڕاجە دا (عارضة) بچێتە ژوورەوە ، بە مەرجێ ئەو تیپەی گۆڵی تۆمار کردووە هیچ سەرپێچیەکی لە بەندەکانی یاسای یاری نەکردبێت پێش تۆمارکردنی گۆڵەکە.

### تیپی سەرکەوتوو ( براوە ): Winning Team

ئەو تیپەی زۆرترین گۆڵ لە کاتی یاری دا تۆمار بکات ، ئەو تیپە براوەیە ئەگەر هەردوو تیپ ژمارەیەکی یەکسان گۆڵیان تۆمار کرد یان هەردووکیان نەیان توانی گۆڵ تۆمار بکەن ئەوا ئەنجامی یاری بەرامبەرە واتە یەکسانن.




١- گۆڵ نیە
٢- گۆڵ نیە
٣- گۆڵ نیە
٤- گۆڵە

### یاساکانی پێشبرکێ: Competition Rules

ئەگەر یاساکانی پێشبرکێ بڕیاری دابێت بە دیارخستنی تیپی براوە لەو یاریەی کە کۆتایی دێت بە یەکسان بوون ئەوا پشت بەو شێوازانەی خوارەوە دەبەسترێت:

### ڕێگاکانی دیاریکردنی تیپی براوە:

١- یاسای گۆڵەکانی دەرەوە (لە دەرەوەی یاریگای خۆی).

٢- کاتی زیاد کراو (٢×١٥) خولەك.

٣- لێدانەکانی یەکلاکەرەوە لە خاڵی سزا.



## یاسای یازدەم /( دزەکردن ) ئۆفساید Offside :-

### وەستان لە شوێنی دزە Offside position

بە سەرپێچی کردن دانانرێت ، ئەگەر تەنها یاریزانەکە لە شوێنی دزە دابوو

### پێناسەکان : Definitions

❖ یاریزان بە دزەکراو دادەنرێت ئەگەر :

(یاریزانەکە نزیکتربوو لە هێڵی گۆڵی تیپی بەرامبەر لە هەردوو تۆپ و دوایین دووەم یاریزان لە تیپی بەرامبەر).




❖ یاریزان بە دزەکردوو ناژمێردرێت ئەگەرهاتوو:

١- لە نیوەی یاریگای تایبەتی خۆی بێت.

٢- لەگەڵ دوایین دووەم یاریزانی تیپی بەرامبەر لە یەك ئاست دا بێت.

٣- لەگەڵ دوو یاریزانی دواوەی تیپی بەرامبەر لە یەك ئاست دا بێت.

### سەرپێچی : Offence

ئەو یاریزانەی کە لە شوێنی دزە دایە سزا دەدرێت تەنها لەو کاتەی بەر تۆپ دەکەوێ یان یاریزانێکی تری تیپەکەی، تۆپەکەی بۆ ڕەوانە دەکا ، کە ناوبژیوان لەو باوەڕەدایە کە یاریزانەکە بەشدارییەکی چالاکانەی کردووە، لە ڕێگەی :

١- بەشداری لەو یارییە بکات.

٢- بەشداری لەگەڵ یاریزانی بەرامبەرەکەی بکات.

٣- سوود لەو هەڵە وەربگرێ کە خۆی لەو شوێنەدا بووە.

٤ - بۆ سەرپێچی ئۆفساید داوەر لێدانی ناڕاستەوخۆ بۆ تیپی بەرامبەر دەژمێرێت لە شوێنی ڕوودانی سەرپێچییەکە .

## ئەو بارانەی کە بە سەرپێچی دانانرێت: No Offence

یاریزان بە سەرپێچی کردنی خۆ دزینەوە دانانرێت ئەگەر راستەوخۆ تۆپی لەم بارانەوە بۆ هات:

١- لێدانی گۆڵ.

٢- لێدانی گۆشە.

٣- هەڵدانی لا.




هێلکاری رونکردنەوەی دزە ( ئۆفساید)

## ❖ یاسای دوازدەهەم /هەڵە و بەد رەفتاری ( الاخطاء وسوء السلوك ) :- Fouls and misconduct

سزای هەڵەوبەد رەفتاری بەم شێوازانە دەدرێت:

## ❖ لێدانی سەربەستی راستەوخۆ: Direct Free Kick

ئەگەر یەکێ لە یاریزانەکان یەك لەم (١٠) هەڵانەی خوارەوەی ئەنجام دا ، لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆ بۆ تیپەکەی تر دەژمێردرێت وەك:

١- تێهەڵدان یان هەوڵی تێهەڵدانی بەرامبەرەکەی بکات.

٢- بەردانەوە یان هەوڵی بەردانەوەی بدات.

٣- بازدان بۆ سەریاریزانی بەرامبەر.

٤- بەکارهێنانی شان بە شێوەیەکی نایاسایی.

٥- لێدان یان هەوڵی لێدانی بەرامبەرەکەی بکات.

٦- پاڵ دانی یاریزانی بەرامبەر.

٧- هێرش بردنەسەر یاریزانی بەرامبەر.

٨- گرتنی یاریزانی بەرامبەر.

٩- تف لە بەرامبەرەکەی بکات.

١٠- تۆپەکە بە ئەنقەست بە دەست بگرێت (گۆڵچی ناگرێتەوە ئەگەر لە ناو ناوچەی سزای خۆی دا بێت).

## ❖ لێدانی سزا : Penalty Kick

لێدانی سزا دەژمێردرێت ئەگەر یەکێ لە یاریزانەکان لە ناو ناوچەی سزای خۆی دا یەکێ لەم (١٠) هەڵانەی پێشوو بکات بێ گوێدانە شوێنی تۆپەکە بەڵام بە مەرجێ تۆپ لە یاری دا بێت.

## ☒ لێدانی ناراستەوخۆ : Indirect Free Kick

- ئەگەر گۆڵچی یەکێ لەم هەڵانەی خوارەوەی لە ناو ناوچەی سزای خۆی ئەنجام دا ئەوا لێدانی سەربەستی ناراستەوخۆ بۆ تیپەکەی تر دەژمێردرێت.

١- گرتنی تۆپ بە دەست زیاتر لە (٦) چرکە.

٢- جارێکی تر دەست لە تۆپ بدا دوای ئەوەی فڕییدا لە باوەشی بێ ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت.

٣- تۆپی بە دەست گرتەوە دوای ئەوەی بە ئەنقەست لە لایەن یەك لە برادەرەکانی بۆی گەڕێندرایەوە.

٤- یەکێ لە برادەرەکانی لە کاتی هەڵدانی لا ڕاستەوخۆ تۆپی بۆ ڕەوانە کرد ، ئەویش بە دەست گرتیەوە.

- لێدانی ناراستەوخۆ دەدرێت بە تیپی بەرامبەر ئەگەر یەك لە یاریزانەکان یەك لەم چوار هەڵانەی خوارەوە ئەنجام بدات :

١- یاریکردن بە شێوەیەکی ترسناك.

٢- بەرهەڵستی لە هاتنە پێشەوەی یاریزانی بەرامبەر بکات.

٣- ڕێگا لە گۆلچی بگرێت کاتێك دەیەوێت تۆپەکە هەڵبدات.

٤- ئەنجامدانی هەر سەرپێچیەکی تر کە لە بەندەکانی یاسای (١٢) باسی نەکرابێت، کە یاری وەستێندرابێت لە لایەن ناوبژیوان بۆ پێدانی کارتی زەرد یان سور، یاریەکە دەست پێدەکاتەوە بە لێدانی ناراستەوخۆ لەو شوێنەی کە هەلەکەی تێدا ڕوویداوە.

## ❖ سزادانی سەرزەنشتی – ( عقوبات تأديبية ) Disciplinary Sanctions :

## ئەو سەرپێچیانەی کە شایستەی ئاگادار کردنەوەن : Cautionable Offences

ئەگەر یاریزانێك یەك لەم هەڵانەی خوارەوەی ئەنجام دا ، سزای ئاگادارکردنەوە (کارتی زەرد) وەردەگرێ وەك :



1. ئەنجامدانی ڕەفتاری نا وەرزشیانە.
2. دەربرینی ناڕەزایی بە گوتە و بە کردار.
3. سوور بوون لەسەر سەرپێچی کردن یاساکانی یاری.

4. دواخستنی دەستپێکردنەوەی یاری.

5. ڕێز نەگرتنی ماوەی پێویست لە کاتی جێ بەجێکردنی (لێدانی گۆشە–لێدانی سەربەخۆ–هەڵدانی لا).

6. هاتنە ناو یاریگا یان دووبارە هاتن بۆ ناو یاریگا بە بێ پرسی ناو بژێوان.

7. بە جێ هێشتنی یاریگا بە ئەنقەست بە بێ پرس و ئاگاداری ناوبژێوان.



## ❖ سەرپێچییەکانی شایستەی دەرکردنن "کارتی سوور" : Sending-Off Offences

یاریزان یان یاریزانی یەدەگ یان یاریزانی گۆڕاو دەردەکرێت بەکارتی سورئەگەر یەکێك لەم (٧) هەلانە ئەنجام بدات :

1. تاوانبار بە بێ ئەنجامدانی یاری توندو تیژ.

2. تاوانبار بێ بە ڕەوشتێکی ناشرین و نا بەجێ.

3. تف لە یاریزانی بەرامبەری یان هەر کەسێکی تر بکات.

4. قەدەغەکردنی تیپی بەرامبەر لە گۆڵ تۆمارکردن یان لە هەلێکی مسۆگەری گۆڵ تۆمارکردن بە گرتنی تۆپ بە دەست بە ئەنقەست (تەنها گۆڵچی ناگرێتەوە ئەگەر لە ناوەوەی ناوچەی سزای خۆیدا بێت).

5. بێ بەشکردنی یاریزانی تیپی بەرامبەر کە بەرەو گۆڵەکە دەجولێتەوە لە هەلێکی مسۆگەر بۆتۆمارکردنی گۆل بە ئەنجامدانی یەکێ لە هەڵەکان کە دەبێتە هۆی ژماردنی لێدانی ڕاستەوخۆ یا لێدانی سزا.

6. بەکارهێنانی ووتەی نا بەجێ یان نیشانەی شەڕانگێزی یان سوکایەتی پێ کردن.

7. دووەم ئاگادارکردنەوەی (دووەم کارتی زەردی) لە هەمان یارییدا پێ بدرێ.



## یاسای سێزدەم / لێدانی سەربەست (الركلات الحرة) Free kicks:-

### جۆرەکانی لێدانی سەربەست: Types of Free Kicks

لێدانی سەربەست ، راستەوخۆ ، یان نا راستەوخۆیە

پێویستە تۆپەکە بە وەستاوی لە لێدانی سەربەستی راستەوخۆ و نا راستەوخۆ یاری پێ بکرێت نابێ ئەو یاریزانەی کە لێدانەکەی جێ بەجێ کرد تۆپی بەربکەوێ تا تۆپەکە بەر یاریزانێکی تر نەکەوێ.

### لێدانی سەربەستی راستەوخۆ: The Direct Free Kick

١- دەتوانرێ لە لێدانی سەربەستی راستەوخۆ یەکسەر گۆڵ تۆمار بکرێت لە تیپی بەرامبەر.

٢- ئەگەر لێدانی سەربەستی راستەوخۆ یەکسەر بۆ گۆڵی هەمان تیپ جێ بەجێ کرا ئەوا لێدانی گۆشە بۆ تیپەکەی تر دەژمێردرێت.

### لێدانی سەربەستی نا راستەوخۆ: The Indirect Free Kick

### ئاماژە یان هێما / Signal

ناوبژیوان فیکەی لێدانی سەربەستی ناراستەوخۆ لێ دەدا ، دەستێکی لەسەرووی سەرییەوە بەرز دەکاتەوە ، دەستەکەی بە بەرزی دەمێنێتەوە تا لێدانەکە بە تەواوی جێ بەجێ دەکرێ و تۆپەکە بەر یاریزانێك دەکەوێت و دەکەوێتە یاری یان بکەوێتە دەرەوەی یاریگا.

### چوونە ژوورەوەی تۆپ بۆ ناو گۆڵ / Ball enters the goal

ئەگەر لە دوای لێدانی تۆپەکە پێش چوونە ژوورەوەی بۆ ناو گۆڵ بەر یاریزانێکی تر کەوت ، ئەو کاتە بە گۆڵ دەژمێردرێت.

١- ئەگەر لە لێدانی سەربەستی ناراستەوخۆ یەکسەر گۆڵ لە تیپی بەرامبەر تۆمار کرا؟

- گۆڵ ناژمێردرێت تیپەکەی تر لێدانی گۆڵ جێ بە جێ دەکات.

٢- ئەگەر لە لێدانی سەربەستی ناراستەوخۆ یەکسەر گۆڵ لە تیپی خۆی تۆمار کرا؟

- لێدانی گۆشە بۆ تیپەکەی تر دەژمێردرێت.

### شوێنی لێدانی سەربەست/ Position of Free Kick

### لێدانی سەربەست لە ناوەوەی ناوچەی سزا دا : Free kick inside the penalty area

- لێدانی سەربەستی راستەوخۆ و ناراستەوخۆ بۆ تیپی بەگری کار :

١- دەبێت گشت یاریزانەکانی تیپی هێرشبەر لە دووری (١٠) یاردە (٩,١٥) م لە تۆپەکە دووربن.

٢- پێویستە گشت یاریزانەکانی تیپی هێرشبەر لە دەرەوەی ناوچەی سزادا بن تا تۆپەکە دەکەوێتە یاری.

٣- ئەو کاتە تۆپەکە دەکەوێتە یاری ئەگەر یەکسەر بۆ دەرەوەی ناوچەی سزا لێ بدرێ.

٤- لێدانی سەربەست لە هەر خاڵێکی ناو ناوچەی گۆڵ ژمێردرا ، لەو شوێنە لێدانەکە جێ بە جێ دەکرێت.

❖ لێدانی سەربەستی ناراستەوخۆ بۆ تیپی هێرشبەر :

١- پێویستە گشت یاریزانەكانی تیپی بەرگریكار بە لایەنی كەم لە دووری (١٠) یاردە (٩,١٥) م لە تۆپەكە دووربن تا تۆپەكە دەكەوێتە یاری ، تەنها ئەگەر لەسەر هێڵی گۆڵی خۆیان بن لە نێوان هەردوو ئەستوون ئەوا بۆیان هەیە لەم ماوەیە كەمتر بوەستن.

٢- بە لێدانی تۆپەكە یان جولاندنەوەی بۆ پێشەوە دەكەوێتە یاری.

٣- لێدانی سەربەستی ناراستەوخۆ لە ناو ناوچەی گۆڵدا ، لە هەر بەشێكی سەر هێڵی ناوچەی گۆڵ تەریب بە هێڵی گۆڵ و نزیك ئەو شوێنەی كە سەرپێچی تیا كراوە جێ بەجێ دەكرێت.

### لێدانی سەربەست لە دەرەوەی ناوچەی سزادا : Free kick outside the penalty area

١- پێویستە گشت یاریزانەكانی تیپی بەرامبەر لایەنی كەم لە ماوەی (١٠) یاردە (٩,١٥) م لە تۆپەكەوە دوور بن.

٢- ئەو كاتەی لە تۆپەكە دەدرێ و دەجولێ ،تۆپەكە دەكەوێتە یاری.

٣- لێدانی سەربەست لە شوێنی روودانی سەر پێچی دا جێ بەجێ دەكرێت.



### یاسای چواردەم / لێدانی سزا( ركلة الجزاء ) - The penalty kick :-

لێدانەی سزا دەژمێردرێت دژی ئەو تیپەی كە یەكێ لەو (١٠) هەڵانەی كە بەلێدانی سەربەستی راستەوخۆ سزا دەدرێ ، لە ناو ناوچەیسزای خۆیدا ئەنجام بدات ، بە مەرجێ بێت تۆپ لە یاری دا بێت.
دەتوانرێ لە لێدانی سزا یەكسەر گۆڵ تۆمار بكرێت ، كاتێ یاری درێژدەكرێتەوە لە كۆتایی هەر گێمێك لە گێمەكانی یاری یان لە كۆتایی هەر ماوەیەك بە ماوەی زیادكراویشەوە تا وەكو لێدانی سزاكە جێ بەجێ دەكرێت.

### شوێنی تۆپ و یاریزانەكان : Position of the Ball and the Players

❖ تۆپ لەسەر خاڵی سزا دادەنرێت.

❖ ئەو یاریزانەی لێدانی سزا جێ بەجێ دەكات

❖ ناسنامەی لێدەری لێدانی سزا دەبێت دەستنیشان بكرێت.

### گۆڵچی تیپی بەرگری كەر :

پێویستە گۆڵچی لەسەر هێڵی گۆڵ لە نێوان ئەستوونەكان بوەستێت، بەرامبەر لێدەری سزا ، تا تۆپەكە لێدەدرێت.



## شوێنی یاریزانەکان جگە لە لێدەری سزا:

١- لەناو یاریگا بن.

٢- لە دەرەوەی ناوچەی سزا بن.

٣- لە پشت خاڵی سزا بن.

٤- دووربن لە خاڵی سزا ماوەکەی کەمتر نەبێت لە (٩,١٥) م (١٠) یاردە.

## ناوبژیوان :

١- ناوبژیوان ئاماژەی جێ بەجێ کردنی لێدانی سزا نادا ، تا یاریزانەکان لە شوێنی دیاری کراوی خۆیان ئامادە نەبن.

٢- هەر ئەو بڕیار دەدات کە لێدانی سزا کۆتایی پێ هاتووە یان تەواو بووە.

## کارە پێویستەکان (الاجراءات):- Procedure

١- ئەو یاریزانەی لێدانی سزا جێ بەجێ دەکا دەبێ تۆپەکە بۆ پێشەوە لێ بدات.

٢- تا تۆپەکە بەر یەکێکی تر نەکەوێت ، نابێ دووبارە یاری پێ بکاتەوە.

٣- لەو کاتەی تۆپەکە لێدەدرێ و بۆ پێشەوە یان دەجوڵێنرێت تۆپەکە دەکەوێتە یاری.

٤- لە کاتی لێدانی سزا ئەگەر کاتی یاسایی یاری تەواو بێت ، ئەوا کاتی یاری درێژ دەکرێتەوە تا لێدانەکە جێ بەجێ دەکرێت یان دووبارە کردنەوەی جێ بەجێکردنەکە تەواو دبێت.

## یاسای پازدەم /هەڵدانی لا (رمیة التماس)- The throw in:-

هەڵدانی لا ڕێگایەکە بۆ دەست پێکردنەوەی یاری ، ناتوانرێ ڕاستەوخۆ گۆڵ لە هەڵدانی لا تۆمار بکرێت.

هەڵدانی لا دەدرێت:-

١- ئەو کاتەی تۆپەکە بە تەواوی هێڵی تەنیشتەکان چ لەسەر زەوی یان ئاسمان ببرێت و بچێتە دەرەوەی یاریگا.

٢- لەو شوێنەی کە تۆپەکەی تیا چووەتە دەرەوە ، تیپەکەی تر جێ بەجێ ی دەکات.

٣- ئەو یاریزانەی دوا جار تۆپەکەی بەرکەوت و بچێتە دەرەوەی یاریگا هەڵدانی لا دەدرێتە تیپەکەی تر.

## ڕێنماییەکانی جێ بەجێکردن : Procedure



پێویستە یاریزانی جێبەجێ کاری هەڵدانی لا ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکات :

١- ڕووی لە ناوەوەی یاریگا بێت.

٢- پێویستە بەشێکی هەردوو پێ ی لەسەر هێڵی لا یان لەسەر زەوی لە دەرەوەی هێڵی لا بێت.

٣- هەردوو دەستی بەکاربهێنێ.

٤- تۆپەکەی لە دوای پشتی سەریەوە لەسەر سەرییەوە هەڵبدات.

**تێبینی/**

١- تا تۆپەکە بەر یەکێکی تر نەکەوێت ، نابێ هەڵدەری لا دووبارە تۆپەکەی بەربکەوێتەوە.

٢- هەر لەو کاتەی تۆپەکە گەیشتە ناو یاریگا ، دەکەوێتە یاری.

٣- لەسەر هەموو یاریزانانی بەرامبەر پێویستە بوەستن بۆماوەی کەمتر نەبێت لە (٢) م لە خاڵی جێ بەجێکردنی هەڵدانی لا.



## یاسای شازدەم / لێدانی گۆڵ (ركلة المرمى) The Goal kick :-

لێدانی گۆڵ ڕێگایەکە بۆ دەست پێکردنەوەی یاری ، دەتوانرێ لە لێدانی گۆڵ ڕاستەوخۆ گۆڵ تۆمار بکرێت . بەڵام تەنها دژی تیپی بەرامبەر بێت.



### لێدانی گۆڵ دەژمێردرێت لەو کاتەی:

تۆپەکە بەر یاریزانێکی تیپی هێرشبەر بکەوێت و بە تەواوی لە هێڵی گۆڵەوە بچێتە دەرەوە لە هەوا یان لەسەر زەوی بە مەرجێ گۆڵی تێدا تۆمار نەکرابێت.

### ڕێگاکانی جێ بەجێکردن : Procedure

١- لێدانی گۆڵ لە لایەن یاریزانێکی تیپی بەرگری کار ئەنجام دەدرێت لەهەر خاڵێکی ناوچەی گۆڵدا.

٢- یاریزانەکانی تیپی بەرامبەر لە دەرەوەی ناوچەی سزا دەمێننەوە تا تۆپەکە دەکەوێتە یاری.

٣- نابێ لێدەری لێدانی گۆڵ جارێکی تر یاری بە تۆپ بکات تا تۆپەکە بەر یاریزانێکی تر نەکەوێت.

٤- لەو کاتەی تۆپەکە ڕاستەوخۆ بۆ دەرەوەی ناوچەی سزا لێ دەدرێت ئەو کاتە دەکەوێتە یاری.

### سەرپێچییەکان/ سزاکان: Infringements/Sanctions

❖ ئەگەر لێدانی گۆڵ ڕاستەوخۆ بۆ دەرەوەی ناوچەی سزا بۆ ئەوەی تۆپەکە بکەوێتە یاری جێ بەجێ نەکرا ، لێدانەکە دووبارە دەکرێتەوە.

- لەوكاتەی تۆپەکە کەوتە یاری و پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت ئەگەر لێدەری گۆڵ (تەنها بە دەست نەبێت) دووبارە بەری کەوتەوە لێدانی سەربەستی ناراستەوخۆ لەو شوێنەی کە سەرپێچی تیا کراوە بۆ تیپەکەی تر دەژمێردرێت.
- لەو کاتەی تۆپەکە کەوتە یاری و پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت ئەگەر لێدەری گۆڵ بە ئەنقەست تۆپەکە بگرێتە وە یان بە دەستی کەوت:ـ.

– لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆ لەو شوێنەی کە سەرپێچی تیا کراوە بۆ تیپەکەی تر دەژمێردرێت.

– لێدانی سزا دژی لێ دەدرێت ئەگەر سەرپێچی یکە لە ناوچەی سزای خۆیدا رووی دابێ.

– لەو کاتەی تۆپەکە کەوتە یاری و پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت ، ئەگەر لێدەری گۆڵ گۆڵچی بوو( تەنها بە دەست نەبێت) دووبارە تۆپەکەی بەرکەوتەوە:ـ

– لێدانی سەربەستی ناراستەوخۆ لەو شوێنەی کە سەرپێچی تیا کراوە بۆ تیپەکەی تر دەژمێردرێت.

– لەو کاتەی تۆپەکە کەوتە یاری و پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت ئەگەر لێدەری گۆڵ گۆڵچی بووبە ئەنقەست تۆپەکەی گرتەوە یا بە دەستی کەوت:

– لێدانی سەربەستی ناراستەوخۆ دەدرێتە تیپی بەرامبەر ئەگەر سەرپێچییەکە لە دەرەوەی ناوچەی سزادا بوو.

– لێدانی سەربەستی ناڕاستەوخۆ دەدرێتە تیپی بەرامبەر ئەگەر سەرپێچییەکە لە ناوچەی سزای خۆیدا ڕوویدات.

### بۆ هەر سەرپێچییەکی تری تایبەت بەم بەندە :-

لێدانەکە دووبارە دەبێتەوە.

Ball in play = تۆپ لە یاریە

Ball out of play = تۆپ لە دەرەوەی یاریە



## یاسای حەڤدەم / لێدانی گۆشە (الركلة الركنية) The corner kick :-

لێدانی گۆشە ڕێگایەکە بۆ دەست پێ کردنەوەی یاری ، دەتوانرێ ڕاستەوخۆ لە لێدانی گۆشە گۆڵ تۆمار بکرێت بەڵام تەنها دژی تیپی بەرامبەر.



❖ لێدانی گۆشە دەژمێردرێت ئەو کاتەی:

تۆپەکە بە تەواوی هێڵی گۆڵ لەسەر زەوی یا لە هەوادا ببڕێت و بچێتە دەرەوەی یاریگا ، وە تۆپەکە بەر یاریزانێکی تیپی بەرگری کار کەوتبێت.بە مەرجێ نەبێتە هۆی تۆمارکردنی گۆڵ بە پێی برگەکانی یاسای ژمارە (١٠).

### ڕێنماییەکانی جێ بەجێکردن: Procedure

١- تۆپەکە لە ناوەوی کەوانەی گۆشەدا بۆ نزیکترین ئاڵای گۆشە دادەنرێت.

٢- نابێ ئاڵای گۆشە بجوڵێندرێت.

٣- دەبێت یاریزانی تیپی بەرامبەر بە لایەنی کەم (١٠) یاردە (٩,١٥) م لە کەوانەی گۆشە دووربن تا تۆپەکە دەکەوێتە یاری.

٤- لێدانی گۆشە لە لایەن یەکێك لە یاریزانانی تیپی هێرشبەر جێ بەجێ دەکرێت.

٥- لە کاتی لێدان و جوڵانەوەی تۆپەکە دەکەوێتە یاری.

٦- ئەو یاریزانەی لێدانی گۆشە جێ بەجێ دەکات نابێت دووبارە یاری بە تۆپ بکات تا بەر یاریزانێکی تر نەکەوێت.






Correct = دروستە

Incorrect = نادروستە

## پرسیارو راهێنان

پ١/ ڕێگەدان بە چوونە ژوورەوەی یاریزانەکان بۆ ناویاریگالەدەسەلاتی -------------------- ە .

١- ناوبژیوانی چوارەم .

٢- یاریدەدەرانی ناوبژیوان .

٣- ناوبژیوان .

٤- گشت ئەوانەی باس کراون.

پ٢/ ئایا ناوبژیوان دەبێ چۆن هەلس وکەوت بکات ئەگەر لەکاتی ڕۆیشتنی یاری هەستی کرد یەك لەتیپەکان هەولدەدات بدۆڕێنێ؟

١- کۆتایی بە یاری دێنێ .

٢- یاری دەوەستێنی وسەرۆك تیپ ئاگاداردەکاتەوە.

٣- سەرنجی تیپی مەبەست بۆخۆی ڕادەکێشێ ئەگەر ئەوان بەردەوام بن لەیاریکردن بەم شێوازە ئەوا یاریەکە کۆتایی پێ دینێ .

٤- ناوبژیوان بۆی نیە لێ ی بکۆلێتەوە ڕێگە دەدات بەبەردەوام بوونی یاری .

پ٣/ دوای فیکەی ناوبژیوان بۆ کۆتایی پێ هێنانی یاری، یاریزانێك هەستا بەلێدانی یاریزانی بەرامبەری ، ئایا ناوبژیوان چۆن هەلس وکەوت دەکات ؟

١- ئاگادار کردنەوەی یاریزانەکە بەکارتی زەردو باس کردنی لەڕاپۆرتەکە ی.

٢- دەرکردنی یاریزانەکە بەکارتی سور و باس کردنی لەڕاپۆرتەکە ی.

٣- تەنها لە ڕاپۆرتەکەی ئاماژەی پێ دەکات.

٤- پەیوەندی پێوە نیە چونکە سەرپێچیەکە دوای فیکەی کۆتایی بووە .

پ٤/ ناوبژیوان کارتی زەردو کارتی سوربەرز دەکاتەوە ئەگەر هاتوو سەرپێچی کرا لەلایەن :-

١- یاریزانی سەرەکی ویاریزانی یەدەگ ( الاساسی والاحتیاط)

٢- ڕاهێنەری تیپ .

٣- کارگێری تیپ .

٤- گشت ئەوانەی باس کراون.

پ٥/ یاریدەدەری ناوبژیوان ئاماژەی دا کە تۆپ تێپەڕبووە لەسەر هێلی لا ، بەلام پێش ئەوەی ناوبژیوان فیکە لێبدات کەوا تۆپ چووەتە دەرەوەی یاریگا یاریزانێکی بەرگری لە یاریزانێکی هێرشبەری دا لەناوناوچەی سزای خۆی ، ئایا بریار چیە ؟

١- ئاگا دارکردنەوەی یاریزانی بەرگریکەر ولێدانی سزا .

٢- دەرکردنی یاریزانی بەرگریکەر ولێدانی سزا .

٣- دەرکردنی یاریزانی بەرگریکەر ودەست پێکردنەوەی یاری بەهەلدانی لا لەبەر چوونەدەرەوەی تۆپ .

٤- هەلدانی لا وباس کردنی ڕووداوەکە لەڕاپۆرتەکە ی.

پ٦/ لەو هۆکارانەی کەوا لەناوبژیوان دەکات یاری بوەستێنێ :-

١- لەبەر توشبونی یاریزانێك بە پێکانێکی توند وگواستنەوەی بۆدەرەوەی یاریگا .

٢- لەبەر هەردەست تێوەردانێکی دەرەکی بەهەر جۆرێك بێت .

٣- بەهۆی هەر سەرپێچیەك لەیاسای یاری .

٤- گشت حالەتەکانی باس کراون .

پ٧/ شوێنی یاریدەدەری ناوبژیوان لەکاتی لێدانی سزا لەناو یاری لەسەر -------------- دەبێت .

١- هێلی لا ( تەنیشت )

٢- هێلی گۆل لەکاتی گەیشتنی بەهێلی لا ( قوس الرکنیة ) .

٣- هێلی گۆل لەکاتی گەیشتنی بەهێلی ناوچەی گۆل .

٤- هێلی گۆل لەکاتی گەیشتنی بەهێلی ناوچەی سزا .

پ٨/ناوبژیوان بۆی هەیە بریارەکەی خۆی بگۆڕێت کاتێك بۆی دەرکەوت بریارێکی نادروستە ئەگەر یاری دەستی پێ نەکردبێتەوە یان کۆتایی پێ نەهاتبێت ئەویش لەرێگەی ئامۆژگاری ....................دەبێت .

١- سەرۆکی تیپ .

٢- یاریدەدەری ناوبژیوان .

٣- یاریدەدەری ناوبژیوان و ناوبژیوانی چوارەم .

٤- ناوبژیوانی چوارەم .

پ٩/ لە ئەرکەکانی ناوبژیوانی یاریدەدەر دیاریکردنی ------------------------- :-

١- کەی تۆپ بەتەواوی تێپەردە بێت بەسەر هێلە کانی یاریگا .

٢- لەکاتی ڕوودانی ڕەوشتی خراپ یان هەرڕووداوێکی تر کە ناوبژیوان نەی توانیبێت بی بینێت.

٣- لەکاتی جێ بەجێکردنی لێدانی سزا ئەگەر گۆلچی هەستا بەجولانەوە بۆ پێشەوە پێش لێدانی تۆپ .

٤- هەمووئەرکەکانی سەرەوە .

پ١٠/ ڕێگە نادرێت کاتی پشووی نێوان هەردوو گێم زیاتر بێت لە :-

١- (١٠) خولەك

٢- (١٥) خولەك

٣- (٥ )خولەك

٤- (٢ ) خولەك .

پ١١/ کاتی یاری درێژ دەکرێتەوە تەنها بۆ جێ بەجێکردنی :-

١- لێدانی ڕاستەو خۆ .

٢- لێدانی کۆرنە .

٣- لێدانی سزا .

٤- گشت حالە تەکانی سەرەوە .

پ١٢/ دیاریکردنی قەرەبوکردنەوەی کاتی بەفیرۆ چوو بە گوێرەی بۆچوونی .............. دەبێت .

١- ناوبژیوانی چوارەم .

٢- یاریزانانی هەردوو تیپ .

٣- ناوبژیوان .

٤- ڕاهێنەرانی هەردوو تیپ .

پ١٣/یاریزانانی یەك لەهەردوو تیپەكان ڕەتیان كردەوە كەبەشداری بكەن لەدەست پێكردنەوەی یاری بەبەردانەوەی تۆپ ، ئایا ناوبژیوان چۆن هەلس و كەوت دەكات ؟

١- ناوبژیوان لە ڕاپۆرتەكەی خۆی دەی نوسێت .

٢- كۆتایی بەیاریەكە دێنی و لەڕاپۆرتەكەی باسی دەكات .

٣- یاری دەست پیّ ناكاتەوە تاوەكو یاریزانانی هەردوو تیپ لەكرداری بەردانەوەی تۆپ ئامادە نەبن .

٤- ناوبژیوان یاری دەست پێدەكاتەوە چونكە پێوست ناكات بەئامادەبوونی یاریزانانی هەردووتیپ لەكاتی دەست پێكردنەوەی یاری بەبەردانەوەی تۆپ.

پ١٤/ لێدانی سەرەتا ڕاستەوخۆ یاری پێكرا بۆگۆلی بەرامبەر ئایابڕیار چیە ؟

١- لێدانی گۆل بۆتیپی بەرامبەر .

٢- دووبارەكردنەوەی لێدانەكە .

٣- گۆل دەژمێردرێت .

٤- لێدانی كۆرنە .

پ١٥/ لێدانی سەرەتا بریتیە لە ڕێگایەك بۆدەست پێكردنی یان دەست پێكردنەوەی یاری لە :-

١- لەكاتی دەست پێكردنی گێمی یەكەم وگێمی دووەمی یاری .

٢- دوای تۆماركردنی گۆل .

٣- لەكاتی دەست پێكردنی هەرگێمیك لەگێمەكانی كاتی زیاد كراو لەكاتی جیّ بەجێكردنی .

٤- گشت بارەكانی سەرەوە.

پ١٦/یاریزانێك لێدانی سەرەتای جیّ بەجێكرد بەلاّم بەدەستەكانی جارێكی تر تۆپەكەی گرت پێش ئەوەی بەریاریزانێكی تر بكەویّ، ئایابڕیارچیە ؟

١- لێدانی گۆل بۆتیپی بەرامبەر .

٢- لێدانی ناڕاستەوخۆ لەبەر ئەوەی دووجار یاری بەتۆپ كردوە .

٣- دووبارەكردنەوەی لێدانەكە لەلایەن تیپی بەرامبەر .

٤- ئاگادار كردنەوەی یاریزانەكە ولێدانی ڕاستەوخۆ بۆ تیپی بەرامبەر .

پ١٧/ ناوبژیوان هەستا بەكرداری بەردانەوەی تۆپ لەسەر هێلی ناوچەی گۆل بۆدەست پێكردنەوەی یاری بەلام تۆپ بەر یاریزانێك كەوت پێش ئەوەی بەرزەوی ی بكەوێت وچوە ناوگۆل، ئایا ناوبژیوان چۆن هەلس و كەوت دەكات ؟

١- لێدانی كۆرنە بۆتیپی بەرامبەر.

٢- ژماردنی گۆل بۆتیپی بەرامبەر.

٣- دووبارەكردنەوەی كرداری بەردانەوەی تۆپ .

٤- لێدانی ناڕاستەوخۆ بۆ تیپی بەرامبەر.

پ١٨/ لەلێدانی سەرەتا یاریزانی جێ بەجێکاری لێدانەکە ڕاستەوخۆ گۆڵی لەتیپەکەی خۆی تۆمارکرد، ئایابڕیارچیە ؟

١- لێدانی کۆرنە بۆتیپی بەرامبەر.

٢- گۆل دەژمێردرێت بۆتیپی بەرامبەر.

٣- لێدانی گۆل.

٤- دووبارەکردنەوەی لێدانی سەرەتا .

پ١٩/ لەکاتی جێ بەجێکردنی لێدانی گۆل تۆپ بەر ناوبژیوان کەوت کەلەدەرەوەی ناوچەی سزابوو وە هەلگەڕاوە چوە ناوگۆل، بڕیار چیە ؟

١- گۆل .

٢- دووبارەکردنەوەی لێدانەکە.

٣- لێدانی کۆرنە بۆتیپی بەرامبەر.

٤- بەردانەوەی تۆپ لەشوێنی بەرکەوتنی بەناوبژیوان .

پ٢٠/ یاریزانێك لەسەر هێلی لا وەستاوە تۆپی بەدەست گرتەوە کەلە دەرەوەی هێلەکەیە بڕیارچیە ؟

١- لێدانی ڕاستەوخۆ .

٢- لێدانی نا ڕاستەوخۆ .

٣- هەلدانی لا.

٤- بەردانەوەی تۆپ .

پ٢١/یاریزانێکی بەرگری تۆپی دوورخستەوە بەلام بەرناوبژیوانی یاریدەدەر کەوت لەسەرهێلی لا، وەچووە لای یاریزانێکی هێرشبەر لەناوناوچەی سزا وگۆلی لێ تۆمارکرد ئایا بڕیارچیە ؟

١- هەلدانی لا.

٢- لێدانی نا ڕاستەوخۆ .

٣- بەردانەوەی تۆپ .

٤- گۆل.

پ٢٢/ ناوبژیوان ئاماژەی دا کە گۆل تۆمار کرا پێش ئەوەی تۆپ بەتەواوی بەسەر هێلی گۆل تێپەڕبێت، پاشان یەکسەرهەستی کرد کەوا هەلەیە، ئایا چۆن هەلس وکەوت دەکات ؟

١- گۆل دەژمێرێت ولەڕاپۆرتەکەی خۆی باسی دەکات .

٢- ڕیگا دەدات بەبەردەوام بوونی یاری ولەڕاپۆرتەکەی خۆی باسی دەکات .

٣- ئەنجام دانی کرداری بەردانەوەی تۆپ لەسەر هێلی گۆل لەنزیك شوێنی ڕووداو .

٤- دەست پێکردنەوەی یاری بەلێدانی گۆل بۆتیپی بەرگریکەر.

پ٢٣/ یاریزانێك بەتەنیا لەگەل گۆل مایەوە وەتۆپەکەی بۆگۆل لێدا ، پێش ئەوەی تۆپەکە بچێتە ناوگۆل یەکێك لەهاندەران هاتە ناویاریگاو نەی هێشت تۆپەکە بچێتە ناوگۆل ، ئایا بڕیارچیە ؟

١- گۆل دەژمێردرێت.

٢- لێدانی ناڕاستەوخۆبۆ تیپی بەرامبەر .

٣- یاری بەردەوام دەبێت وناوبژیوان لەڕاپۆرتەکەی خۆی دەینوسێت .

٤- یاری دەوەستێنی ، ویاری دەست پێدەکاتەوە بەبەردانەوەی تۆپ لەسەر هێلی گۆل لەنزیکترین شوێنی ڕوودا.

پ٢٤/ ناوبژیوان ئاماژەی دابەژماردنی گۆل ،بەلام یاریدەدەری ناوبژیوان ئالاکەی بەرزکردەوە و ئاماژەی دا کەوایێش ئەوەی تۆپەکە بچێتە ناوگۆل یاریزانێکی هێرشبەر هەستاوە بەلێدانی یاریزانێکی بەرگری ،ئایاناوبژیوان چۆن هەلس وکەوت دەکات ؟

١- گۆل وئاگادار کردنەوەی یاریزانی هێرشبەر .

٢- گۆل وباس کردنی لەڕاپۆرتەکە .

٣- لێدانی سزا وەدەرکردنی یاریزانی هێرشبەر .

٤- دەرکردنی یاریزانی هێرشبەرو لێدانی سەربەخۆ بۆتیپی بەرگری لەشوێنی ڕوودانی سەرپێچیەکە .

پ٢٥/ یاریزان سزا دەدرێت لەڕاوەستانی لەشوێنی دزە لەوکاتەی تۆپی بەردەکەوێت یان یەکێك لەهاوەلەکانی یاری پێدەکات وەبەبۆچوونی ناوبژیوان بەشداره لەیاری چالاك وكاریگەر لەرێگەی :-

١- بەشداریکردن لەیاری .

٢- بەشداریکردن لەگەل بەرامبەر .

٣- سوود وەرگرتن لەڕاوەستانی لەو شوێنە . ٤- هەمووبارەکانی سەرەوە .

پ٢٦/یاریزانێکی هێرشبەر لەباری دزەدایە (موقف تسلل ) لەناو ناوچەی سزا ی تیپی بەرامبەر، یاریزانێکی بەرگری لێ ی دا ، تۆپیش لەنیوە گۆرەپانەکەی تردایە ،ئایا بریارچیە؟

١- ئاگادارکردنەوەی یاریزانی بەرگری وبەردانەوەی تۆپ لەشوێنی وەستانی یاری.

٢- دەرکردنی یاریزانی بەرگری ولێدانی ناڕاستەوخۆ.

٣- دەرکردنی یاریزانی بەرگری ولێدانی سزا.

٤- دەرکردنی یاریزانی بەرگری وژماردنی دزە لەسەر یاریزانی هێرشبەر.

پ٢٧/ یاریزانێکی بەرگریکەر هەستا بەچوونەدەرەوە لەهێلی گۆلی خۆی بۆئەوەی یاریزانی بەرامبەر بخاتە باری دزە ، ئایا ناوبژیوان چ بریارێك دەردەکات ؟

١- وەستاندنی یاری وئاگادار کردنەوەی یاریزانی بەرگریکەر ودەست پێکردنەوەی یاری بەبەردانەوەی تۆپ .

٢- وەستاندنی یاری ودەرکردنی یاریزانی بەرگریکەر ودەست پێکردنەوەی یاری بە لێدانی ناڕاستەوخۆ .

٣- ژماردنی دزە لەسەر هێرشبەر .

٤- رێگەدان بەبەردەوام بوونی یاری وئاگادار کردنەوەی یاریزانی بەرگریکەرلەیەکەم هەل کەتۆپ دەکەوێتە دەرەوەی یاری

پ٢٨/یاریزانێك هەستا بەهاوێشتنی پێلاوەکەی بۆیەك لەیاریزانەکانی تیپی بەرامبەر لەناوناوچەی هونەری،ئایا ناوبژیوان چۆن هەلس وکەوت دەکات ؟

١- ئاگادار کردنەوەی یاریزانەکەو بەردانەوەی تۆپ لەشوێنی سەرپێچیە کە .

٢- دەرکردنی یاریزانەکەو بەردانەوەی تۆپ لەشوێنی سەرپێچیە کە .

٣- دەرکردنی یاریزانەکەو لێدانی ناڕاستەوخۆ لەشوێنی سەرپێچیە کە .

٤- دەرکردنی یاریزانەکەو لێدانی ڕاستەوخۆ لەشوێنی سەرپێچیە کە .

پ٢٩/ یاریزانێك لەناو ناوچەی سزای خۆی لەناوبژیوانیدا، ئایا ناوبژیوان چ بڕیارێك دەدات ؟

١- ئاگادار كردنەوەی یاریزانەكە ولێدانی سزا بۆتیپی بەرامبەر .

٢- دەركردنی یاریزانەكە ولێدانی سزا بۆتیپی بەرامبەر .

٣- دەركردنی یاریزانەكە و دەست پێكردنەوەی یاری بەلێدانی ناڕاستەوخۆ.

٤- دەركردنی یاریزانەكە و دەست پێكردنەوەی یاری بەبەردانەوەی تۆپ .

پ٣٠/ یاریزانێكی بەرگری هەستا بەبەرزكردنەوەی تۆپ و گەڕاندنەوەی بەسەری بۆگۆڵچی خۆی، كەتۆپەكەی گرتەوە ، ئایا ناوبژیوان چ بڕیارێك دەدات ؟

١- رێگەدان بەبەردەوام بوونی یاری.

٢- ئاگاداركردنەوەی یاریزانەكەو دەست پێكردنەوەی یاری بەبەردانەوەی تۆپ .

٣- ئاگادار كردنەوەی یاریزانەكە ولێدانی ڕاستەوخۆ لەشوێنی گەڕانەوەی تۆپ.

٤- ئاگاداركردنەوەی یاریزانەكەو دەست پێكردنەوەی یاری بەلێدانی ناڕاستەوخۆ لەبەرئەوەی فێڵی لەیاسای یاری كردوە.

پ٣١/ یاریزانێك رەخنەی لەبڕیاری ناوبژیوان گرت لەكاتی یاری،ئایا ناوبژیوان چۆن هەڵس وكەوت دەكات ؟

١- رێگەدان بەبەردەوام بوونی یاری و لەڕاپۆرتەكەی خۆی باسی دەكات .

٢- ئاگادار كردنەوەی یاریزانەكە ولێدانی ڕاستەوخۆ.

٣- ئاگادار كردنەوەی یاریزانەكە ولێدانی نا ڕاستەوخۆ.

٤- ئاگادار كردنەوەی یاریزانەكەو دەست پێكردنەوەی یاری بەبەردانەوەی تۆپ ،

پ٣٢/ یاریزانێكی بەرگریكەرلەناوناوچەی سزای خۆی كە پارێزەری قاچی(واقیە) بەدەستەوەیە، هەستا بەلێدانی تۆپ وقەدەغەكردنی لەچوونە ناوەوەی گۆڵ ، ئایا ناوبژیوان چ بڕیارێك دەدات ؟

١- ئاگادار كردنەوەی یاریزانەكە ولێدانی نا ڕاستەوخۆ.

٢- دەركردنی یاریزانەكە ولێدانی نا ڕاستەوخۆ.

٣- دەركردنی یاریزانەكە ولێدانی سزا لەبەر قەدەغە كردنی گۆڵ چونكە پارێزەرەكانی قاچ بەدرێژكراوەی دەستی یاریزان دادەنرێت .

٤- ئاگاداركردنەوەی یاریزانەكەو دەست پێكردنەوەی یاری بەبەردانەوەی تۆپ .

پ٣٣/ گۆڵچی هەستا بەلێدانی یاریزانێكی هێرشبەر لەنێوان هێڵی گۆڵ وتۆڕی گۆڵ ( لەناوگۆڵ ) لەكاتی بەڕێوە چوونی یاری ، ئایا ناوبژیوان چۆن هەڵس وكەوت دەكات ؟

١- ئاگاداركردنەوەی گۆڵچی ولێدانی سزا .

٢- دەركردنی گۆڵچی ولێدانی سزا .

٣- دەركردنی گۆڵچی و لێدانی ناڕاستەوخۆ لەشوێنی وەستانی یاری .

٤- وەستاندنی یاری ودەركردنی گۆڵچی وبەردانەوەی تۆپ لەشوێنی وەستانی یاری.

پ٣٤/ یاریزانێكی هێرشبەر هەڵدانی لای جێ بەجێكرد تۆپ ڕۆیشت بۆگۆڵچی تیپی بەرگریكەر، كە نەیتوانی بیگەڕێنێتەوە بۆیە یاریزانێكی هاوەڵی بەدەستی تۆپەكەی هاویشتە دەرەوە لەسەر ڕاجە ( عارچە ) ئایا ناوبژیوان چ بڕیارێك دەدات ؟

١- لێدانی سزا .

٢- ئاگاداركردنەوەی یاریزانەكەو لێدانی سزا .

٣- دەركردنی یاریزانەكەو لێدانی سزا.

٤- لێدانی كۆرنە و ئاگاداركردنەوەی یاریزانەكە.

پ٣٥/ یاریزانێك مۆڵەتی لەناوبژیوان وەرگرت بۆچوونەدەرەوە لەیاریگە كاتێك لەرێگای چوونەدەرەوەی بوو تۆپێكی بۆهات وەریگرت و شوتێكی لێدا چووە ناوگۆل ، ئایا ناوبژیوان چ بریارێك دەدات ؟

١- ئاگاداركردنەوەی یاریزانەكە وژماردنی گۆل .

٢- ئاگاداركردنەوەی یاریزانەكە ولێدانی گۆل .

٣- ئاگاداركردنەوەی یاریزانەكەو دەست پێكردنەوەی یاری بەبەردانەوەی تۆپ لەشوێنی ڕوودانی سەرپێچیەكە .

٤- ئاگاداركردنەوەی یاریزانەكەو دەست پێكردنەوەی یاری بەلێدانی ناڕاستەوخۆ لەشوێنی ڕوودانی سەرپێچیەكە .

پ٣٦/لەو بارانەی(حالەتانەی) كەیاریزان ئەنجامی بدات دەبێتە لێدانی ناڕاستەوخۆ :-

١- یاریكردن بەشێوازێكی ترسناك .

٢- رێگە گرتن لەبەرەو پێش چوونی بەرامبەر .

٣- قەدەغە كردنی گۆلچی لەتۆپ فرێدان لەباوەشی .

٤- گشت بارەكانی باس كراون .

پ٣٧/ یاریزانی جێ بەجێكاری لێدانی سەربەخۆ هەستا بەدەست لێدانی تۆپ بەئەنقەست لەناو ناوچەی سزای خۆی پێش ئەوەی تۆپ بكەوێتەیاری ، ئایابریارچیە؟

١- ئاگادار كردنەوە ودووبارەكردنەوەی لێدانەكە .

٢- ئاگادار كردنەوە و لێدانی ناڕاستەوخۆ .

٣- ئاگادار كردنەوە و لێدانی ڕاستەوخۆ .

٤- لێدانی سزا.

پ٣٨/ لەلێدانی ناڕاستەوخۆ تۆپ بەرناوبژیوان كەوت و هەلگەڕا یەوە چوە ناو گۆل ، ئایا بریارچیە ؟

١- گۆل.

٢- دووبارەكردنەوەی لێدانەكە .

٣- لێدانی كۆرنە .

٤- لێدانی گۆل .

پ٣٩/ لەكاتی جێ بەجێكردنی لێدانی ناڕاستەوخۆ یاریزانێك پێ ی دانا سەرتۆپ و هێنایە خوارەوە ئینجا برادەرەكەی لێیدا بۆناوگۆل ، ئایا ناوبژیوان چۆن رەفتار دەكات ؟

١- لێدانی گۆل دەژمێرێت .

٢- دووبارەكردنەوەی لێدانەكە .

٣- گۆل دەژمێرێت .

٤- لێدانی ناڕاستەوخۆ بۆتیپی بەرامبەر .

پ٤٠/ لەکاتی جیّ بەجیّکردنی لیّدانی ڕاستەوخۆ تۆپ بەریەك لەهاندەران کەوت و ئنجا چووە ناوگۆل ، ئایا ناوبژیوان چۆن ڕەفتار دەکات ؟

١- گۆل دەژمێرێت .

٢- بەردانەوەی تۆپ لەشوێنی بەرکەوتنی تۆپ بەهاندەرەکە .

٣- لیّدانی گۆل.

٤- لیّدانی ناڕاستەوخۆ بۆتیپی بەرامبەر .

پ٤١/ گۆلچی لیّدانی سەربەخۆی جیّ بەجیّکرد پاشان تۆپەکەی بەئەنقەست بەدەستەکانی گرتەوە لەناو ناوچەی سزای خۆی دوا ی ئەوەی تۆپەکە کەوتە یاری ، ئایا بڕیار چیە ؟

١- لیّدانی سزا.

٢- لیّدانی ناڕاستەوخۆ.

٣- یاری بەردەوام دەبێت .

٤- دووبارەکردنەوەی لیّدانەکە .

پ٤٢ /لە ڕێنماییەکانی جیّ بەجیّکردنی لیّدانی سەربەخۆ:-

١- جیّ بەجیّکردنی لیّدانەکە لەشوێنی ڕوودانی سەرپێچیەکە .

٢- دەبێت هەموو یاریزانەکانی تیپی بەرامبەرلەماوەی (١٥، ٩ م ) بوەستن لەتۆپ تاوەکو تۆپ دەکەوێتە یاری.

٣- تۆپ دەبێت لەبارێکی جێگیر بێت .

٤- گشت بارەکانی باس کراون .

پ٤٣/ خالی سزا دەکەوێتە دووری ------------------------------ لە هێلی گۆل .

١- ١١ یاردە .

٢- ١٢ یاردە .

٣- ١٠ یاردە .

٤- ٨ یاردە .

پ٤٤/ ناوبژیوان ڕێگەی دا بۆجیّ بەجیّکردنی لیّدانی سزا پاشان یاریزانێکی هێرشبەر هەستا بەلیّدانی یاریزانێکی بەرامبەر لەدەرەوەی ناوچەی سزا ناوبژیوان ئاگاداری ئەوەبوو، ئایا ناوبژیوان چ ڕێگایەك دەگرێتە بەر ؟

١- ڕێگە دەدات بۆجیّ بەجیّکردنی لیّدانەکە ، گۆل دەژمێردرێت ئەگەر تۆپ چووە ناوگۆل لەگەل ئاگادار کردنەوەی یاریزانی هێرشبەر ، وەئەگەر تۆپ نەچوە گۆل یاری دەست پێدەکاتەوە بەچۆنیەتی چونە دەرەوەی تۆپ .

٢- ڕێگە نادات بۆجیّ بەجیّکردنی لیّدانەکە تاوەکو هێرشبەرەکە دەرنەکات .

٣- ڕێگە دەدات بەجیّ بەجیّکردنی لیّدانەکە، لیّدانەکە دووبارە دەکرێتەوە ئەگەر تۆپ چوە ناوگۆل لەگەل دەرکردنی هێرشبەرەکە، وەئەگەر تۆپ نەچووە ناو گۆل یاری دەست پێدەکاتەوە بەچۆنیەتی چونە دەرەوەی تۆپ .

٤- ڕێگە دەدات بەجیّ بەجیّکردنی لیّدانەکە، لیّدانەکە دووبارە دەکرێتەوە ئەگەر تۆپ چووە ناوگۆل ، وەئەگەر تۆپ نەچووە ناو گۆل یاری دەست پێدەکاتەوە بەلیّدانی ناڕاستەوخۆ بۆتیپی بەرامبەر لەشوێنی ڕوودانی سەرپێچیەکە، لەگەل دەرکردنی یاریزانی هێرشبەر .

پ٤٥/ شوێنی گشت یاریزانەکان لەکاتی جێ بەجێکردنی لێدانی سزا جگە لە یاریزانی جێ بەجێکار:-

١- لەهەر شوێنێکی یاریگا .

٢- لەدووری (١٠یاردە ) لەخاڵی سزا ( دەرەوەی کەوانەی سزا ) .

٣- لەدەرەوەی ناوچەی سزا .

٤- گشت بارەکانی سەرەوە

پ٤٦ / لەکاتی جێ بەجێکردنی لێدانی سزا تۆپ بەر هۆکارێکی دەرەکی کەوت پاشان چوە ناوگۆل ئایا بڕیارچیە ؟

١- گۆل .

٢- بەردانەوەی تۆپ لەشوێنی بەرکەوتنی بەر هۆکارە دەرەکیەکە .

٣- لێدانی گۆل .

٤- دووبارەکردنەوەی لێدانەکە .

پ٤٧/ لێدانی سزا جێ بەجێکرا تۆپ بەر ڕاجە(عارچە) کەوت وگەڕاوە بۆ هەمان یاریزان وگۆلی تۆمارکرد ، ئایا بڕیارچیە ؟

١- گۆل .

٢- دووبارەکردنەوەی لێدانەکە .

٣- لێدانی ناڕاستەوخۆ چونکە دووجار یاری بەتۆپ کردووە .

٤- لێدانی گۆل .

پ٤٨/ یاریزانێك بە پاژنەی پێ ی(کعب)لە لێدانی سزا تۆپی گەڕاندەوە بۆ برادەرەکەی کەئەویش هاوێشتیە ناوگۆل ، ئایا ناوبژیوان چۆن هەلس وکەوت دەکات ؟

١- گۆل .

٢- دووبارەکردنەوەی لێدانەکە چونکە دەبێت تۆپ بۆ پێشەوە لێ بدرێت .

٣- لێدانی ناڕاستەوخۆ چونکە سەرپێچی لە یاسای یاریەکە کردووە .

٤- لێدانی گۆل .

پ٤٩/ یاریزانێك هەستا بەجێ بەجێکردنی هەلدانی لا تۆپەکەی ڕاستەوخۆ هەلدا بۆگۆلچی خۆی کەدەستی لێدا بۆئەوەی بیگەڕێنتەوە لە چونە ناوگۆل ، بەلام تۆپەکە چوە ناوگۆل ، ئایا بڕیارچیە ؟

١- دووبارەکردنەوەی هەڵدانەکە .

٢- لێدانی کۆڕنە .

٣- لێدانی ناڕاستەوخۆ .

٤- گۆل .

پ٥٠/ گۆلچی هەستا بەجێ بەجێکردنی هەڵدانی لا پاشان بەئەنقەست لەناو ناوچەی سزا ی خۆی تۆپەکەی بەدەست گرتەوە وەپێش ئەوەی بەریاریزانێك بکەوێت ، ئایا ناوبژیوان چ بڕیارێك وەردەگرێت ؟

١- دووبارەکردنەوەی هەڵدانەکە .

٢- جێ بەجێکردنی هەڵدانەکە لەلایەن تیپی بەرامبەر .

٣- لێدانی ڕاستەوخۆبۆتیپی بەرامبەر لەشوێنی سەرپێچیەکە .

٤- لێدانی ناڕاستەوخۆبۆتیپی بەرامبەر لەشوێنی سەرپێچیەکە .

پ٥١/ یاریزانێك هەڵدانی لا ی جیّ بەجێکرد بەلام تۆپ نەهاتە ناویاریگا بەلکو هەرلەدەرەوەی هێلی تەنیشت (بەرکەوتن ) مایەوە ، ئایا ناوبژیوان چ بریارێك وەردەگرێت ؟

١- دووبارەکردنەوەی هەڵدانەکە .

٢- دووبارەکردنەوەی هەڵدانەکە لەلایەن تیپی بەرامبەر .

٣- دەستپێکردنەوەی یاری بەبەردانەوەی تۆپ .

٤- لێدانی ناڕاستەوخۆ لەشوێنی جیّ بەجێکردنی هەڵدانەکە.

پ٥٢ /لەرێگاکانی جیّ بەجێکردنی هەلدانی لا:-

١- دەبێت یاریزان بەشێك لە هەردووپێیەکانی لەسەر هێلی بەرکەوتن یان لەسەرزەوی لەدەرەوەی هێلی بەرکەوتن بێت .

٢- هەردوو دەستی بەکار بهێنیت .

٣- تۆپەکە لەدواوەو لەسەر سەری هە لبدات .

٤- هەموو رێگاکانی باس کران .

پ٥٣/ یاریزانێك هەستابەجیّ بەجێکردنی هەلدانی لا وەتۆپەکەی بەئەنقەست لەیەك لە یاریزانەکانی تیپی بەرامبەردا لەناویاریگا ، ئایا ناوبژیوان چ بریارێك وەردەگرێت ؟

١- ئاگادار کردنەوە یىیاریزانەکە ودووبارەکردنەوەی هە ڵدانەکە .

٢- ئاگادار کردنەوە ی یاریزانەکە ودووبارەکردنەوەی لێدانەکە لەلایەن تیپی بەرامبەر .

٣- دەرکردنی یاریزانەکەو لێدانی ناڕاستەوخۆ بۆتیپی بەرامبەر لەشوێنی ڕوودانی سەرپێچی.

٤- دەرکردنی یاریزانەکەو لێدانی ڕاستەوخۆ بۆتیپی بەرامبەر لەشوێنی ڕوودانی سەرپێچی.

پ٥٤/ یاریزانێك هەستابەجیّ بەجێکردنی هەڵدانی لا پاشان تۆپێکی تریشی هەلگرت و هەلیدایە ناویاریگا ، ئایا ناوبژیوان چۆن هەلس وکەوت دەکات ؟

١- ئاگادار کردنەوەی یاریزانەکەو دووبارەکردنەوەی لێدانەکە .

٢- ئاگادار کردنەوەی یاریزانەکەو دووبارەکردنەوەی لێدانەکە لەلایەن تیپی بەرامبەر.

٣- ئاگادار کردنەوەی یاریزانەکەو لێدانی ناڕاستەوخۆ بۆتیپی بەرامبەر لەشوێنی سەرپێچیەکە.

٤- ئاگادار کردنەوە ی یاریزانەکەو بەردانەوەی تۆپ دوای دەرخستنی تۆپی دووەم .

پ٥٥/ گۆلچی لێدانی گۆلی جیّ بەجێکرد،وەدوای ئەوەی تۆپ کەوتە یاری بەدوای تۆپەکە کەوت وبەدەستەکانی گرتیەوە، ئایابریارچیە؟

١- دووبارەکردنەوەی لێدانەکە .

٢- یاری بەردەوام دەبێت .

٣- ئاگادار کردنەوەی گۆلچی ولێدانی ناڕاستەوخۆ .

٤- ئاگادار کردنەوەی گۆلچی ولێدانی ڕاستەوخۆ .

پ ٥٦/ لەلێدانی گۆل یاریزانێکی بەرگری ڕاستەوخۆ گۆلی لە تیپی خۆی تۆمارکرد، ئایابریارچیە ؟

١- گۆل .

٢- لێدانی گۆشە .

❖ دلنیا دەبێت لە ئامادەنەبوونی هیچ کەسێکی رێگە پێنەدراو لە ناو یاریگا.

❖ ئاماژە دەدات بەدووبارە دەستپێکردنەوەی یاری دوای وەستاندنی.

❖ سزادانی یاریزانانی سەرپێچکار بە کارتی زەرد و سور.

**ناوبژیوان :** The referee

❖ کاردەکات وەك : کاتگرو ناوبژیوانی سێ یەم لەکاتی ئامادەنەبوونیان.

❖ یاری دەوەستێنێ یا دوای دەخات ، بە بۆچوونی خۆی لەهەر سەرپێچی کردنێك لە یاساکانی یاری فوتسال.

❖ یاری دەوەستێنێ یا دوای دەخات ، بە بۆچوونی خۆی لەهەر دەست تێوەردانێکی دەرەکی بەهەر جۆرێك بێت.

**ناوبژیوانی دووەم :** The second referee

❖ شوێنی ناوبژیوان دەگرێتەوە لە کاتێك توشی پێکان دەبێت یا باری تەندروستی تێك دەچێت.

■ لە یارییەکانی نێو دەوڵەتی دەبێت ناوبژیوانی دووەم دابندرێت.

**بریارەکانی ناوبژیوانان :** Decisions of the referees

١- ناوبژیوانان بۆیان هەیە بریاری خۆیان بگۆرن، کاتێك هەستی پێ دەکەن کەناراستە بە بۆچوونی خۆیان یان لەسەر ئامۆژگاری یاریدەدەرانی ناوبژیوان بەمەرجێك یاریەکەیان دەست پێ نەکردبێتەوە یاکۆتاییان پێ نەهێنا بێت.

٢- بریاری ناوبژیوان دەخوات بەسەر بریاری ناوبژیوانی دووەم ئەگەر هەردووکیان ئاماژەیان بە بوونی سەرپێچی کرد، وە جیاوازی لە نێوانی بریارەکانیان هەبوو.

٣- لە کاتی هەر دەست تێوەردانێکی نادروست یان رەوشتێکی نا بەجێ ناوبژیوان: ناوبژیوانی دووەم یا یاریدەدەرانی ناوبژیوان دووردەخاتەوە لەئەرکەکانیان، وە ئەرکی تریان بۆ رێك دەخات و راپۆرتێکیش لەم بارەیەوە بۆ دەسەلاتی بەرپرس بەرزدەکاتەوە.





لێدانی ناڕاستەوخۆ



لێدانی سەرەتا – دەستپێکردنەوەی یاری



تۆپ لێدانە ژوورەوە- رکلە ادخال
1



تۆپ لێدانە ژوورەوە-رکلە ادخال
2



لێدانی ڕاستەوخۆ – پەنالتی / سزا





هەڵدانی گۆل
1



هەڵدانی گۆل
2



لێدانی گۆشە 1



لێدانی گۆشە 2



Fifth accumulated foul
پێنجەم هەڵەی کەڵەکەبوو



Time-out کاتی دابڕاو



پێدانی هەلی سودوەرگرتن دوای هەڵەی کەڵەکەبوو



Four-second count (1)
ژماردنی چوارچرکە - 1



Four-second count (2)
ژماردنی چوار چرکە - 2



هەڵەی کەڵەکەبوو دوای پێدانی هەلی سودوەرگرتن 1



هەڵەی کەڵەکەبوو دوای پێدانی هەلی سودوەرگرتن 2



پێدانی هەلی سودوەرگرتن دوای هەڵەیەک کەبە کەڵەکەبوو ئەژماردرێت



هەڵەی کەڵەکەبوودوای جێبەجێکردنی هەلی سودوەرگرتن3 هەڵەی کەڵەکەبوودوای جێبەجێکردنی هەلی سودوەرگرتن 4



ئاگادارکردنەوە - کارتی زەرد



دەرکردن - کارتی سور













## یاسای شەشەم / یاریدەدەری ناوبژیوانان The Assistant Referees

### دەسەلاتی یاریدەدەری ناوبژیوانان : The authority of the assistant referees

دوو یاریدەدەری ناوبژیوان دەتوانرێت دیاری بکرێت (ناوبژیوانی سێ یەم و کات گر) کە دەبێت ئەرکەکانیان بە گوێرەی یاسای یاری فوتسال بە رێوەببەن، شوێنەکانیان دەکەوێتە دەرەوەی یاریگابەرامبەر هێلی ناوەراست لە لای یاریزانە یەدەگەکان ( نێوان هەردوو ناوچەی هونەری) کاتگر دەمێنێتەوە بە دانیشتویی لەسەر مێزی کاتگر بەلام ناوبژیوانی سێ یەم دەتوانێت ئەرکەکەی بە دانیشتویی یا بەراوەستان جێ بەجێبکات.

کاتگر و ناوبژیوانی سێ یەم دەبێت ئامێرێکی کرۆنۆمەتری گونجاویان پێ بدرێت لە گەل چەند کەل و پەلێکی پێویست بۆ پاراستن و تۆمارکردنی هەلە کەلەکەبووەکان، کە لەلایەن یەکێتی یا یانەکە دابین دەکرێت کە یاریەکە لە ژێر دەسەلاتیان بەرێوە دەچێت.

وە هەروەها مێزێکی کاتگریان بۆ دابین دەکرێت بۆ ئەوەی ئەرکەکانیان بە دروستی بەرێوە ببەن.

**دەسەلاَ تەکان و ئەرکەکان:-** Powers and duties

**ناوبژیوانی سێ یەم:** The third referee

- یارمەتی ناوبژیوانان و کاتگردەدات.
- پارێزگاری لە تۆماری ئەویاریزانانە دەکات کە بەشداریان لە یاریدا کردووە.
- چاودێری کاری ئەوانە دەکات کە تۆپ دەهێننەوە لەسەر داخوازی ناوبژیوانان.
- کەل و پەلی یاریزانی یەدەگ دەپشکنێ پێش ئەوەی بچێتە ناو یاریگا.
- ژمارەی گۆلکاران تۆمار دەکات.
- کاتگر ئاگادار دەکاتەوە بە داواکردنی کاتی دابڕاو لە لایەن کارگێری تیپ (بڕوانە یاسای ٧ کاتی یاری).
- پارێزگاری لە تۆماری کاتە دابڕاوەکان دەکات.
- پارێزگاری لە تۆماری هەلەکەلەکەبووەکانی هەردوو تیپ دەکات ئاماژەی بۆ ناوبژیوانان دەکات لە هەردوو گێمی یاری.
- ئاماژە دەداتە ئەو تیپەی کە پێنجەم هەلەی کەلەکەبووی ئەنجام داوە لە یەك لە گێمەکان.
- نیشانەیەك لە سەر مێزی کاتگر دادەنێت ئاماژە دەدات بەو تیپەی کە پێنجەم هەلەی کەلەکەبووی ئەنجام داوە.
- تۆماری ناوو ژمارەی ئەو یاریزانانە دەکات کە ئاگادارکراونەتەوە(کارتی زەرد)ودەرکراون(کارتی سور).
- لە ژێر چاودێری ناوبژیوانان چاودێری ئەو یاریزانە دەکات کە دەچێتە ژوورەوە دوای جێهێشتنی یاریگا بۆ راستکردنەوەی کەل وپەلەکانی.
- لە ژێر چاودێری ناوبژیوانان چاودێری ئەو یاریزانە دەکات کە دەچێتە ژوورەوە دوای جێهێشتنی یاریگا بە هۆی پێکانەوە یا هەر هۆکارێکی تر.
- ئاماژە بۆ ناوبژیوانان دەکات لە کاتی ڕوودانی هەر هەلەیەك لە ئاگادارکردنەوە یا دەرکردنی هەر یاریزانێك یا هەر کارێکی توندوتیژی دوور لە بینینی ناوبژیوانان رووبدات، بە هەر جۆرێك بێت ناوبژیوانان بڕیار دەدەن لەسەر هەر ڕوداوێك کە پەیوەندی بە یاری هەبێت.
- چاودێری هەلس و کەوتی ئەو کەسانە دەکات کە لەناو ناوچەی هونەری دان وە ئاگاداری ناوبژیوانان دەکاتەوە لە هەر هەلس و کەوتێکی ناگونجاو.
- پارێزگاری تۆماری ئەو وەستانانە دەکات لە یاری بە هۆی دەستێوەردانە دەرەکیەکان و هۆکارەکانی.
- شوێنی ناوبژیوانی دووەم دەگرێتەوە لە کاتێك ناوبژیوان یا ناوبژیوانی دووەم تووشی پێکان دەبن یا باری تەندروستیان تێك دەچێت.

## **كات گر :** The timekeeper

١– دڵنیا دەبێت لەكاتی یاری (**مدة المباراة**) كە بە پێ ی بەندەكانی یاسای (٧) بێت.

أ– ئیش پێكردنی كاتژمێر(كرۆنۆمەتر) پاش جێبەجێكردنی لێدانی سەرەتا بە دروستی.

ب– راگرتنی كاتژمێر (كرۆنۆمەتر) كاتێك تۆپ لە دەرەوەی یاری بێت.

ج– ئیش پێكردنەوەی كاتژمێر (كرۆنۆمەتر) دوای دەستپێكردنەوەیەكی دروستی یاری لە دوای: (لێدانی هاوێشتنە ژوورەوە (**ركلة الأدخال**) ، هەڵدانی گۆڵ ، لێدانی گۆشە یا سەرەتا ، لێدانی ئازاد (راستەوخۆ و ناراستەوخۆ)، لێدانەكانی خاڵی سزا یان دووەم خاڵی سزا یان بەردانەوەی تۆپ (اسقاط كرة).

٢– تۆماركردنی گۆڵەكان، هەڵە كەڵەكەبووەكان وە كاتی یاری لە بۆردی تۆماركردن (شاشە) ئەگەر هەبێت لە هۆڵەكە.

٣– ئاماژەكردن بە داوای تیپەكان بۆ كاتی دابڕاو بە فیكەیەك یا دەنگێكی بیستراو كە جیاوازبێت لەگەڵ ئەو دەنگەی ناوبژیوانەكان بەكاری دەهێنن دوای ئەوەی ناوبژیوانی سێ یەم ئاگاداری دەكاتەوە.

٤– گرتنەوەی كات بۆ یەك خولەك بۆكاتی دابڕاو.

٥– ئاماژەكردن بەكۆتایی هاتنی یەك خولەك كاتی دابڕاو بە فیكەیەكی جیاواز یا دەنگێكی بیستراو جیاوازبێت لەگەڵ ئەوەی ناوبژیوانان بەكاری دەهێنن.

٦– ئاماژەكردن بۆ پێنج هەڵەی كەڵەكەبووی هەر تیپێك بە فیكەیەك یا دەنگێكی بیستراو كە جیاوازبێت لەگەڵ ئەو دەنگەی ناوبژیوانەكان بەكاری دەهێنن دوای ئەوەی ناوبژیوانی سێ یەم ئاگاداری دەكاتەوە.

٧– گرتنەوەی كات بۆ دوو خولەك بۆیاریزانی دەركراو.

٨– ئاماژەدان بۆ كۆتایی هاتنی گێمی یەكەم ، كۆتایی هاتنی یاری و وە كۆتایی هاتنی ماوەی زیادكراو بە فیكەیەكی جیاواز یا دەنگێكی بیستراو جیاوازبێت لەگەڵ ئەوەی ناوبژیوانان بەكاری دەهێنن.

٩– شوێنی كاتگر لەسەر مێزی كاتگر دەبێت بەوشێوەی كە وەسفی كراوە لە رێنماییەكانی (شیكردنەوەی یاساكانی یاری فوتسال و رێنماییەكان بۆ ناوبژیوانان (یاسای ٥) كە پێویستە بەم شێوەیەی داواكراوە ئەركەكەی جێبەجێبكات.

١٠– هەڵدەستێ بەئەنجامدانی ئەركە دیاریكراوەكانی ناوبژیوانی سێ یەم لەكاتێ نەهاتنی ئەوەی دوایی.

**تێبینی**//لەیارییە نێودەولەتیەكان دەبێت ناوبژیوانی سێ یەم و كاتگر دابندرێن.





## یاسای حەوتەم / کاتی یاری :- THE DURATION OF THE MATCH

### ماوەی یاری : period of play

ماوەی یاری دوو گێمی یەکسانە ، هەر گێمێك (٢٠) خولەکە، ئەگەر هیچ ڕازیبونێك نەبێت لە نێوان ناوبژیوانان و هەردوو تیپ، هەر ڕەزامەندیەك بۆ گۆڕینی کاتی یاری دەبێت پێش دەست پێکردنی یاری بڕیاری لەسەر بدرێت وە لەگەل یاساکانی پێش برکێکان بگونجێت.

### کۆتایی هاتنی کاتی یاری : Ending the periods of play

کاتگر ئاماژەدەکات بە کۆتایی هاتنی هەریەك لە گێمەکان  بە فیکەیەکی جیاواز یا دەنگێکی بیستراو ، دوای بیستنی فیکەی کاتگر یا دەنگە بیستراوەکە یەك لەناوبژیوانەکان بڕیاری کۆتایی هاتنی ماوەی یاری دەدات بە فیکەکەی، وەلە مێشکیدا ڕەچاوی ئەوانەی خوارەوە دەکات:

–ئەگەر لێدان لە خالی سزای دووەم یا لێدانی ڕاستەوخۆ، کە سەرەتای هەلەی کەلەکەبووی شەشەم بوو، دەبێت لێدانەکە جیٚ بە جێبکرێت یا دووبارەبوونەوەی جیٚ بە جێبکرێت، وە کاتی یاری درێژ دەکرێتەوە تاوەکو لێدانەکە جیٚ بەجێدەکرێت.

–ئەگەر لێدانی سزا جیٚ بە جێبکرێت یا دووبارەکرایەوە، کاتی یاری درێژ دەکرێتەوە تاوەکو لێدانەکە جیٚ بەجێدەکرێت.

ئەگەر تۆپ بۆ یەك لە گۆلەکان لێدرا، دەبێت ناوبژیوانان چاوەڕێی کۆتایی لێدانەکە (ئەنجامی شوتەکە) بکەن، پێش ئەوەی کاتگر فیکە لێبدات یا هێما بیستراوەکە بەرزبکاتەوە، کات تەواو دەبێت کاتێك:

- تۆپ ڕاستەوخۆ بچێتە ناوگۆل وگۆل تۆماربکرێت.
- تۆپ سنورەکانی یاریگا بە جیٚ بهێلێت.
- تۆپ بەر گۆلچی و ستونەکانی گۆل بکەوێت یا بەر ڕاجە یا زەوی بکەوێت، تێپەر بێت بەسەر هێلی گۆل و گۆل تۆمار بێت.
- گۆلچی تیپی بەرگری تۆپەکە بوەستێنیٚ، یا لە ستوونەکانی گۆل یا ڕاجە هەلبگەرێتەوە، بەلام هێلی گۆلی نەبری بێت.

ئەگەر هیچ سەرپێچی یەك ئەنجام نەدرابێت کە سزاکەی لێدانی سەربەخۆ بێت، یا دووبارەکردنەوەی لێدانی سزا بێت، یا لەکاتی ڕێرەوی تۆپ بێت، یەك لە تیپەکان هیچ سەرپێچی یەکی ئەنجام نەدابێت کە بڕیارەکەی لێدانێکی ڕاستەوخۆ بێت، وەسەرەتای هەلەی کەلەکەبووی شەشەم بێت، یا لێدانی سزا بێت، کات تەواو دەبێت کاتێك:

- تۆپ بەر هەر یاریزانێك بکەوێت بێجگە لە گۆلچی، پاش ئەوەی کە بۆ گۆلی تیپی بەرامبەر لێدرا.

### کاتی دابڕاو : Time-out

تیپەکان مافی وەرگرتنی یەك کاتی دابڕاویان هەیە بۆ یەك خولەك لە هەر گێمێك.

ئەو مەرجانەی خوارەوە جیٚ بەجێدەکرێت:

- بەرپرسەکانی تیپ دەسەلاتی ئەوەیان هەیە داوای کاتی دابڕاو بکەن لە ناوبژیوانی سێ یەم، یا کاتگر ئەگەر ناوبژیوانی سێ یەم نەبوو، بەبەکار هێنانی ئەوکارتەی پێیان دراوە.
- کاتگر کاتی دابڕاو دەدات، کاتێك ئەو تیپەی داوایکردووە تۆپی لە دەست بێت (لەکۆنترۆلی بێت) وە تۆپ لەدەرەوەی یاری بێت، بەبەکارهێنانی فیکەیەکی جیاواز یا هێمایەکی جیاواز لەوەی کە بەکاردێت لەلایەن ناوبژیوانان.
- لە ماوەی کاتی دابڕاو، دەبێت یاریزانەکان بمێننەوەوە لەسەر یا لەلێواری یاریگا( نزیك ناوچەی هونەری)، بۆئەوەی خواردنەوە وەربگرن، دەبێت یاریزانەکان یاریگا جێ بهێڵن.
- لە ماوەی کاتی دابڕاو، دەبێت یاریزانەجێگرەوەکان (یەدەگەکان) لەدەرەوەی یاریگا بمێننەوەوە.
- لە ماوەی کاتی دابڕاو، ڕێگا نادرێت بەبەرپرسانی تیپ ئەرك وڕێنمایی بدەن لەناو زەوی یاریگا.
- دەتواندرێت گۆرانکاری ئەنجام بدرێت تەنها دوای ئەوەی فیکە لێدەدرێت یا دەنگێکی ئاشکرا دەبیسترێت بۆ ئاماژەکردن بە کۆتایی هاتنی کاتی دابڕاو.
- ئەو تیپەی کە داوای کاتی دابڕاوی نەکردووە لە گێمی یەکەمی یاری، تەنها ماف یەك کاتی دابڕاوی هەیە لە گێمی دووەم.
- ئەگەر هاتوو نە ناوبژیوانی سێ یەم هەبوو، وە نە کاتگر، ئەوا بەرپرسانی تیپ دەتوانن داوای کاتی دابڕاو لە ناوبژیوانان بکەن.
- کاتی دابڕاو لە ماوەی زیاد کراو نیە، ئەگەر یاری کرا.

**ماوەی پشووی نێوان گێمەکان :** Half-time interval

یاریزانەکان مافی پشوویان هەیە لە نێوان گێمەکان.

نابێت ماوەی پشووی نێوان گێمەکان لە (١٥) خولەك زیاتر بێت.

دەبێت یاسای پێشبڕکێکان ماوەی پشووی نێوان گێمەکان دیاری بکات.

ماوەی پشووی نێوان گێمەکان دەتواندرێت تەنها بەڕەزامەندی ناوبژیوان بگۆڕدرێت.

**یاری وەستێندراو :** Abandoned match

یاری وەستێندراو دووبارە دەکرێتەوە ئەگەر یاسای پێشبڕکێکان پێچەوانەی ئەمە نەبێت.

## یاسای هەشتەم / دەست پێکردن ودووبارە دەست پێکردنەوەی یاری :- THE START AND RESTART OF PLAY

**کارە پێویستیە سەرەتاییەکان :** Preliminaries

تیرو پشك بە پارچە دراوێکی کانزایی دەکرێت ئەو تیپەی تیرو پشك دەباتەوە بڕیار دەدات بۆ کام گۆل هێرش دەبات لە گێمی یەکەم لە یاری.

تیپەکەی تر لێدانی سەرەتا جێ بەجێ دەکات بۆ دەست پێکردنی یاری.

ئەو تیپەی کە تیروپشکی بردۆتەوە لێدانی سەرەتا جێ بەجێ دەکات لە گێمی دووەم لە یاری.

لە گێمی دووەمی یاری تیپەکان نیوەی یاریگاکانیان دەگۆڕنەوە وە هێرش بۆ گۆڵی پێچەوانە دەبەن.

**لێدانی سەرەتا : Kick-off**

لێدانی سەرەتا ڕێگایەکە بۆ دەست پێکردن یا دووبارە دەست پێکردنەوەی یاری:

١- لە کاتی دەستپێکردنی یاری.

٢- لە دوای ئەوەی گۆل تۆماردەکرێت.

٣- لە کاتی دەست پێکردنی گێمی دووەمی یاری.

٤- لە کاتی دەست پێکردنی هەرگێمێك لە کاتی زیادکراو لە کاتی پەیرەویکردنی.

ناتوانرێت ڕاستەوخۆ گۆڵ تۆمار بکرێت لە لێدانی سەرەتا.

**کارە پێویستەکان : Procedure**

١- دەبێت گشت یاریزانەکان لە نیوەی یاریگای تایبەت بە خۆیان بن.

٢- گشت یاریزانانی بەرامبەری ئەو تیپەی لێدانی سەرەتا جێ بەجێدەکات بووەستن لە دووری کەمتر نەبێت لە (٣) مەتر تاکو تۆپەکە دەکەوێتە یاری.



٣- پێویستە تۆپەکە چەسپاو بێت لە سەر خاڵی ناوەڕاست.

٤- ناوبژیوان ئاماژە دەدات.

٥- تۆپ لە یاری دەبێت کاتێك لێدرا وە جوڵا بۆ پێشەوە.

دوای ئەوەی گۆڵ تۆمارکردەکرێت، وەکاتی یاری کۆتایی نەهاتبێت لێدانی سەرەتا جێ بەجێدەکرێت لە لایەن تیپەکەی تر.

**سەرپێچیەکان و سزاکان : Infringements and sanctions**

ئەگەر تۆپ لە یاری بێت وە ئەو یاریزانەی لێدانەکەی جێ بەجێکردووەدووبارە تۆپی بەرکەوتەوە ( جگە لە بەرکەوتنی دەستەکانی) وە پێش ئەوەی بەر هەر یاریزانێکی تر بکەوێت:

- لێدانێکی سەربەخۆی ناڕاستەوخۆ دەدرێتە تیپی بەرامبەر، وە جێ بە جێدەکرێت لەو شوێنەی کە هەڵەکەی تێدا ڕوویداوە.

ئەگەر تۆپ لە یاری بێت وە ئەو یاریزانەی لێدانەکەی جێ بەئەنقەست دەستی لە تۆپدا، وە پێش ئەوەی بەر هەر یاریزانێکی تر بکەوێت:

- لێدانێکی سەربەخۆی ڕاستەوخۆ دەدرێتە تیپی بەرامبەر، وە جێ بە جێدەکرێت لەو شوێنەی کە هەڵەکەی تێدا ڕوویداوە. وە تیپەکەی سزا دەدرێت بە هەڵەیەکی کەڵەکەبوو.

لە کاتی ڕوودانی هەر سەرپێچی یەك لە ڕێنماییەکانی جێ بەجێکردنی لێدانی سەرەتا:

- لێدانی سەرەتا دووبارە دەبێتەوە،وە ناتواندرێت هەلی سود وەرگرتن جێ بەجێبکرێت.

## بەردانەوەی تۆپ (اسقاط الكرة):- Dropped ball

ئەگەر: كاتێك بەردەوام تۆپ لە ناو یاری بوو، ناوبژیوانان ویستیان وابوو یارییەكە بە شێوەیەكی كاتی بوەستێنن لەبەر هەر هۆكارێك كە لە هیچ شوێنێكی یاسای یاری فوتسال باسی نەكرابێت، ئەوا یاری دەست پێ دەكاتەوە بەبەردانەوەی تۆپ، وە هەروەها یاری دەست پێ دەكاتەوە بەبەردانەوەی تۆپ ئەگەر لە یاسای یاری فوتسالدا ئاماژەشی بۆ كرابوو.

## كارە پێویستەكان ( الاجراءات): Procedure

ناوبژیوان یا ناوبژیوانی دووەم تۆپ بەردەدەنەوە لە شوێنی تۆپ كاتێك یاری تێدا وەستێندرا،ئەگەرهاتوو یاری نەوەستێندرابوو لەناو ناوچەی سزا.لەم بارانە یەك لەناوبژیوانان تۆپ بەردەدەنەوە لەسەر هێڵی ناوچەی سزا لەنزیكترین خاڵ لەو شوێنەی كەوا تۆپی تێدابوو كاتێك یاری وەستێندرا.

یاری دەست پێ دەكاتەوە كاتێك تۆپ بەر زەوی یاریگا یا هەر خاڵێك لە سنوری یاریگا بكەوێت، ئەگەر تۆپەكە زەوی یاریگای بەجێهێشت دوای ئەوەی بەر زەوی كەوت بێ ئەوەی بەر هیچ یاریزانێك بكەوێت دوای ئەوەی كەوتە یاری، تۆپەكە بەردەدرێتەوە لەهەمان خاڵ كە یەكەمجار لێ ی بەردرایەوە.



## سەرپێچییەكان و سزاكان: Infringements and sanctions

تۆپەكە دووبارە بەردەدرێتەوە لەهەمان شوێن كە یەكەمجار لێ ی بەردرایەوە:

- ئەگەر تۆپەكە بەر یاریزانێك بكەوێت پێش ئەوەی بەر زەوی بكەوێت.
- ئەگەر هەر سەرپێچی یەك ئەنجامدرا پێش ئەوەی تۆپ بەر زەوی بكەوێت.

## یاسای نۆیەم/ تۆپ لە یاری دا و لە دەرەوەی یاریدا:-THE BALL IN AND OUT OF PLAY

تۆپ لە دەرەوەی یاری دەبێت كاتێك:

- كاتێك تۆپەكە هەمووی بە تەواوی تێپەر دەبێت بەسەر هێڵی گۆڵ یا هێڵی تەنیشت (بەركەوتن) چ لەسەر زەوی یان لە هەوادا.
- یاری دەوەستێندرێت لەلایەن ناوبژیوانان.
- تۆپ بەر بنمێچ (سقف) بكەوێت.

### تۆپ له یارییدایه :

تۆپ له یاری دەبێت له گشت بارەکان وه ئەم کاتانەش دەگرێتەوه:

- تۆپەکه بەر ئەستوونەکان یا راجه (عارضة) بکەوێت و له ناو یاریگا بمێنێتەوه.
- ئەگەر بەر یەکێك له ناوبژیوانەکان بکەوێت کاتێك له ناو یاریگا بن.

### هۆڵه داخراوەکان : Indoor pitch

کەمترین بەرزی بنمیچەکان (سقفەکان) چوار مەترە، وەئەم مەرجه دادەنرێت له یاسای پێش برکێکان.
ئەگەر تۆپ بەر بنمیچ بکەوێت کاتێك له یاریدا بێت، یاری دەست پێدەکاتەوه به لێدانی ناردنه ژوورەوه له لایەن بەرامبەری ئەو تیپەی که دواجار تۆپی بەرکەوتووە.وه لێدانی ناردنه ژوورەوه جێ بەجێدەکرێت لەو خاڵەی هێلی تەنیشت که نزیکترین شوێنه لەو زەویەی که له سەرەوەی تۆپەکه بەر بنمیچ کەوتوه.




### یاسای دەیەم / رێگای تۆمارکردنی گۆڵ:- THE METHOD OF SCORING

### گۆڵ تۆمارکردن: Goal scored

گۆڵ تۆمار دەکرێت کاتێك تۆپەکه هەمووی به تەواوی تێپەر دەبێت لەسەر هێلی گۆل له نێوان هەردوو ستوونی گۆڵ و له ژێر راجه به مەرجێك هیچ سەرپێچی یەك له یاسای یاری فوتسال ئەنجام نەدرابێت پێشتر لەلایەن ئەوتیپەی گۆلی تۆمارکردووە.
گۆل هەژمار ناکرێت ئەگەر گۆلچی تیپی هێرشبەر بەئەنقەست تۆپەکه بهاوێژێت یا لێبدات بەدەستی یاقۆلی لەناو ناوچەی سزای خۆی، وه دوایین یاریزانیش بێت تۆپەکەی بەرکەوتبێت یا یاری پێ کردبێت، یاریەکه دەست پێ دەکاتەوه بەهەلدانی گۆل بۆ تیپی بەرامبەر.
ئەگەر، دوای ئەوەی که گۆل تۆمارکرا، ناوبژیوانان زانیان پێش دەستپێکردنەوەی یاری کەوا ئەو تیپەی گۆلی تۆمار کردووە، یاری دەکات به یاریزانێکی زیادە(٦)، یا کرداری گۆرانکاریان به شێوەیەکی نادروست ئەنجام داوە، دەبێت ئەو گۆله هەژمار نەکەن و یاریەکه دەست پێ بکەنەوه به لێدانێکی ناراستەوخۆ جێ بەجێدەکرێت لەلایەن بەرامبەری ئەوياريزانەی سەرپێچی کردووە له هەر خالێك له ناو ناوچەی سزا، ئەگەر لێدانی سەرەتا جێ بەجێکرا ئەوا رێ و شوێنی تایبەت بەرامبەر یاریزانی سەرپێچی کار وەربگرن به گوێرەی یاسای (٣) بەلام گۆلەکه هەژمار دەکرێت، وەناوبژیوانەکان راپۆرتێك بۆلایەنی

بەرپرس بەرزدەکەنەوە، بەلام ئەگەر گۆلەکە لە لایەن تیپی بەرامبەر تۆمارکرا ئەوا دەبێت هەژماری بکەن.



**تیپی براوە:** Winning team

ئەو تیپەی لە یارییەکە زۆرترین گۆڵ تۆمار بکات ئەوا تیپی براوەیە، بەلام ئەگەر هەردوو تیپ وەك یەك گۆڵیان تۆمار کرد، یا هیچ گۆلێك تۆمار نەکرا، ئەوا یارییەکە بە بەرامبەر بوون دادەنرێت.

**یاسای پێشبڕکێکان :** Competition rules

کاتێك یاسای پێشبڕکێکان داوا دەکات بە دیاریکردنی تیپی براوە دوای یاری، یا دوای یاری هاتوو چوون، تەنها ئەوانەی خوارەوەرێگە پێدراون بۆپەیرەویکردنی بۆ دیاریکردنی تیپی براوە:

- یاسای گۆلەکانی هاتووچوون. **away goals rule**
- ماوەی زیادکراو. **extra time**
- لێدانەکان لە خالی سزا. **kicks from the penalty mark**

ئەو رێوشوێن گرتنەبەرەلەم بەشەدا باسی کراوەلە ژێر ناونیشانی:

**( رێگاکانی دیاریکردنی تیپی براوەلە یاری، یا لە یاری هاتوو چوون )**

**یاسای یازدەهەم: دزە کردن ( ئۆفسایت ) :** OFFSIDE

لە یاری فوتسال دزەکردن ( ئۆفسایت ) نیە.

**یاسای دوازدەهەم/ هەڵە و بەدرەوشتی ( الاخطاء وسوء السلوك ):-** FOULS AND MISCONDUCT

هەڵە و بەدرەوشتی سەرپێچین لە یاساکانی یاری فوتسال وە سزا دەدرێن بەم شێوەیە:

**هەلەکان :** **Fouls**

هەلەکان سزا دەدرێن بە لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆ، لێدانی سزا یا لێدانی سەربەستی ناڕاستەوخۆ.

هەلەکانی سزادەدرێن بە لێدانی سەربەخۆی ڕاستەوخۆ:**Fouls penalized with a direct free kick**

لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆدەدرێتە تیپی بەرامبەر ئەگەر یەك لەیاریزانەکان یەك لەم حەوت هەلانەی خوارەوەی ئەنجامدا بە رێگەیەك بە بۆچوونی ناوبژیوان کەمتەرخەم بوو(اهمال) یا بایەخی نەدا بەئەنجامی کارەکەی (تهور) یا هێزێکی زۆری تێدا بەکارهێنابوو:

- تێهەڵدان یان هەوڵی تێهەڵدانی بەرامبەرەکەی بکات.
- بەردانەوەی یان هەوڵی بەردانەوەی بدات.
- بازدانەبۆ سەر بەرامبەرەکەی.
- شان لێدانی بەرامبەرەکەی.
- لێدان یان هەوڵی لێدانی بەرامبەرەکەی بکات.
- پاڵدانی بەرامبەرەکەی.
- خۆخزاندن بۆ بەرامبەرەکەی.

هەروەها لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆدەدرێتە تیپی بەرامبەر ئەگەر یەك لەیاریزانەکان یەك لەم سێ هەلانەی خوارەوەی ئەنجامدا:

- بەرامبەرەکەی بگرێت.
- تف لە بەرامبەرەکەی بکات.
- تۆپەکە بە ئەنقەست بەدەست بگرێت (جگە لەگۆڵچی کاتێك لە ناو ناوچەی سزای خۆی بێت).

لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆ جێبەجێ دەکرێت لەوشوێنەی کە هەلەکەی تێدا ڕوودواە.

ئەو سەرپێچی یانەی سەرەوە هەڵەی کەلەکە بوون (**اخطاء متراكمة**).

**ئەو هەلانەی سزا دەدرێن بە لێدانی سزا :** Fouls penalized with a penalty kick

لێدانی سزا دەژمێردرێت ئەگەر هەر یەك لەم دە هەلانەی سەرەوە ئەنجامدرا لە ڕێگەی یاریزانێك لە ناو ناوچەی سزای خۆی ، بێ ڕەچاوکردنی شوێنی تۆپەکە، بە مەرجێ تۆپ لە یاری بێت.

**هەلەکانی سزادەدرێن بە لێدانی سەربەستی ناڕاستەوخۆ: Fouls penalized with an indirect free kick**

لێدانی سەربەستی ناڕاستەوخۆ دەدرێت بە تیپی بەرامبەر ئەگەر گۆڵچی یەك لەم چوار هەلأنەی خوارەوە ئەنجام بدات:

١- تۆپەکە کۆنترۆڵ بکات بەدەستەکانی یا بە پێ ی،لە ناو نیوە یاریگەی خۆی بۆ زیاتر لە چوار چرکە.

٢- دوای یاری کردنی بە تۆپ، دووبارە تۆپەکەی بەرکەوتەوە لەناو نیوە یاریگەی خۆی دوای ئەوەی بە ئەنقەست بۆی لێدرا لە ڕێگەی هاوەلێکی تیپەکەیەوە بەبێ یاری پێکردنی یاریزانی بەرامبەر یا بەرکەوتنی.

٣- تۆپەکەی بەر دەست بکەوێت لە ناو ناوچەی سزای خۆی دوای ئەوەی بە ئەنقەست بۆی لێدرا لە ڕێگەی یەك لە هاوڕێیەکانی.

٤- تۆپەکە بەردەستی بکەوێت لە ناو ناوچەی سزای خۆی دوای ئەوەی ڕاستەوخۆ وەری گرت لە لێدانی ناردنە ژوورەوە لە ڕێگەی یەك لە هاوڕێیەکانی.

هەروەها لێدانی سەربەستی ناڕاستەوخۆ دەدرێتە تیپی بەرامبەر ئەگەر بە بۆچوونی ناوبژیوان یاریزانێك:

- یاری بکات بە شێوەیەکی ترسناك بە ئامادەبوونی یاریزانی بەرامبەر.
- ڕێگربێت لە بەرەوپێش چوونی یاریزانی بەرامبەر.
- گۆڵچی قەدەغە بکات لە فرێدانی تۆپ لە ناو دەستەکانی.
- ئەنجامدانی یەك لەو نۆ هەلانە لە گەل هاوڕێیەکی تیپەکەی کە سزاکەی لێدانی سەربەخۆیە ئەگەر لەگەل یاریزانی بەرامبەر ئەنجامی بدات.
- ئەنجامدانی هەر سەرپێچییەکی تر کە لە یاسای (١٢) یا هەر یاسایەکی تر باسی نەکرابێت، کە بۆئەمە یاری وەستێندرابێت بۆ ئاگادارکردنەوە یا دەرکردنی یاریزان.

لێدانی سەربەستی ناراستەوخۆ جێ بەجێدەکرێت لەو شوێنەی کە هەلەکەی تێدا ڕوودواوە.

## بەد ڕەوشتی : Misconduct

بەدرەوشتی سزا دەرێت بە ئاگادارکردنەوە یا دەرکردن.

## سزادانی سەرزەنشتی – ( عقوبات تأديبية ) Disciplinary Sanctions

کارتی زەرد بەکاردێت بۆ ڕاگەیاندن بەوەی کەوا یاریزانێك یا یاریزانێکی یەدەگ ئاگادارکراوەتەوە.

کارتی سور بەکاردێت بۆ ڕاگەیاندن بەوەی کەوا یاریزانێك یا یاریزانێکی یەدەگ دەرکراوە.

کارتی سور یا زەرد دەتواندرێت تەنها نیشانبدرێت بۆ یاریزان یا یاریزانی یەدەگ.

ناوبژیوانان دەسەلاتی پێدانی سزای سەرزەنشتیان هەیە لەو چرکەیەی کە دێنە ناویاریگا کە شوێنەکەی دیاریکراوە پێش دەست پێکردنی یاری تاوەکو یاریگا بەجێ دەهێلن.

## ئەو سەرپێچی یانەی کە شایستەی ئاگادارکردنەوەن : Cautionable offences

١. یاریزان ئاگادار دەکرێتەوە ئەگەر یەك لەم حەوت سەرپێچی یانەی خوارەوە ئەنجام بدات:
٢. ڕەوشتی ناوەرزشی.
٣. نارەزایی دەربرێت بە ووتە یا بە کردار.
٤. سووڕ بوون لەسەر سەرپێچی کردن لەسەر یاساکانی یاری فوتسال.
٥. دواخستنی دەستپێکردنەوەی یاری.
٦. ڕێز نەگرتنی ماوەی دیاریکراو کاتێك یاری دەست پێ دەکاتەوە بە لێدانی گۆشە، لێدانی سەربەخۆیا لێدانی ناردنە ژوورەوە (یاریزانەکانی بەرگریکار).
٧. هاتنە ناو یاریگا یان دووبارە هاتن بۆ ناو یاریگا بە بێ پرسی ناو بژیوان، یا سەرپێچی کردن لە ڕێنماییەکانی کرداری گۆڕین.
٨. بە جێ هێشتنی یاریگا بە ئەنقەست بێ ڕوخسەتی ناوبژیوان.

یاریزانی یەدەگ ئاگاداردەکرێتەوە ئەگەر یەك لەم چوار سەرپێچی یانەی خوارەوە ئەنجام بدات:

١. ڕەوشتی ناوەرزشی.
٢. نارەزایی دەربرێت بە ووتە یا بە کردار.
٣. دواخستنی دەستپێکردنەوەی یاری.
٤. هاتنە ناو یاریگا بە سەرپێچی کردن لە ڕێنماییەکانی کرداری گۆڕین.

**ئەو سەرپێچی یانەی کە شایستەی دەرکردنن: Sending-off offences**

یاریزان دەردەکرێت ئەگەر یەك لەم حەوت سەرپێچی یانەی خوارەوە ئەنجام بدات:

١. یاری توندو تیژ.
٢. ڕەوشتی ناشرین و نا بەجێ.
٣. تف لە یاریزانی بەرامبەری بکات یان لە هەر کەسێکی تر.
٤. قەدەغەکردنی تیپی بەرامبەر لە گۆڵ تۆمارکردن یان لە هەڵێکی مسۆگەری گۆڵ تۆمارکردن بە دەست لێدانی تۆپ بە ئەنقەست (ئەمەلەسەر گۆڵچی جێ بەجێ ناکرێت کە لە ناو ناوچەی سزای خۆیدا بێت).
٥. قەدەغەکردنی گۆل یا هەلێکی مسۆگەری گۆل تۆمارکردن لە یاریزانی تیپی بەرامبەر کە بەرەو گۆڵەکەی ئەم یاریزانە دەجولێتەوە بەهەلەیەك کە سزادەدرێت بە لێدانی ڕاستەوخۆ یا لێدانی سزا.
٦. بەکارهێنانی زمانی هێرشبردن، سوکایەتی پێ کردن یا شەڕانگێزی.
٧. دووەم ئاگادارکردنەوە وەربگرێت لە هەمان یاری.

یاریزانی یەدەگ دەردەکرێت ئەگەرئەو سەرپێچی یەی خوارەوە ئەنجام بدات:

- قەدەغەکردنی گۆل یا هەلێکی مسۆگەری گۆل تۆمارکردن.

هەر یاریزانێك یا یاریزانێکی یەدەگ کە دەردەکرێت دەبێت سنوری یاریگا (لێوارەکانی) و ناوچەی هونەری بە جێ بهێڵێت.

## یاسای سێزدەهەم/ لێدانی سەربەست:- FREE KICKS

**جۆرەکانی لێدانی سەربەست: Types of free kick**

لێدانەکانی سەربەست یا ڕاستەوخۆیە یا ناڕاستەوخۆ.

**لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆ: The direct free kick**

ئاماژەکردن: Signal

یەك لەناوبژیوانەکان ئاماژەدەکات بۆ لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆ بە پاراستنی یەك لەدەستەکانی بە شێوەیەکی ستونی وە دیاریکردن و ئاماژەکرن بۆ ئەو ئاراستەی کەوا دەبێت لێدانەکەی لێ جێ بەجێبکرێت، وە ناوبژیوان بەدەستەکەی تری ئاماژە بۆ زەوی دەکات بۆ ئەوەی بۆ ناوبژیوانی سێ یەم و کاتگر ئاسان بێت کەوا ئەم هەلەیە هەلەی کەلەکەبووە.

**تۆپ چووە ناو گۆل:** Ball enters the goal

- ئەگەر لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆ، ڕاستەوخۆ بۆ گۆلی بەرامبەر لێدرا ئەوا گۆل دەژمێردرێت.
- ئەگەر لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆ، ڕاستەوخۆ بۆ گۆلی تیپەکەی خۆیان لێدرا، ئەوا لێدانی گۆشە دەدرێتە تیپی بەرامبەر.

**هەڵەی کەڵەکە بوو (الاخطاء المتراكمة):-** **Accumulated fouls**

- ئەو هەلانەن کە سزادەرێن بە لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆ یا لێدانی سزا کە لەیاسای (١٢) باسیان کراوە.
- هەلە کەلەکەبووەکانی ئەنجام دەدرێن لە لایەن هەرتیپێك لە هەر گێمێگ، تۆماردەکرێن لە ڕاپۆرتی یاری.
- ناوبژیوان لەوانەیە ڕیگا بدات یاری بەردەوام بێت بە جێ بەجێکردنی هەلی سود وەرگرتن ئەگەر تیپەکە پێشتر هەلەی پێنجەمی کەلەکەبوویان ئەنجام نەدابێت، وەئەگەر تیپی بەرامبەر گۆل یان هەلێکی مسۆگەری گۆل تۆمارکردنیان قەدەغەنەکردبوو.
- ئەگەر هەلی سود وەرگرتن جێ بەجێکرا،ناوبژیوان هێمایەك بەکاردێنێت بۆ ئاماژەکردن بە هەلەی کەلەکەبوو بۆ کاتگرو ناوبژیوانی سێ یەم هەرکاتێك تۆپ کەوتە دەرەوەی یاری.
- ئەگەر ماوەی زیادکراو یاری کرا، ئەوا هەلەکانی کەلەکەبووی گێمی دووەم بەردەوام دەبێت لە کاتی ماوەی زیادکراو.

**لێدانی سەربەستی ناڕاستەوخۆ:** The indirect free kick

ئاماژەکردن: Signal

ناوبژیوانان ئاماژەدەکەن بۆ لێدانی سەربەستی ناڕاستەوخۆ بەبەرزکردنەوەی دەستیان لەسەر سەریان، دەستیان لەو شوێنە دەمێنێتەوە تاوەکو لێدانەکە جێ بەجێدەکرێت و تۆپەکە بەر یاریزانێکی تر دەکەوێت یا دەکەوێتە دەرەوەی یاریگا.

**تۆپ چووە ناو گۆل:** Ball enters the goal

دەتواندرێت گۆل تۆماربکرێت تەنها ئەگەر تۆپەکە دوای یاری کردنی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت پێش ئەوەی بچێتە ناو گۆل:

- ئەگەر لێدانی سەربەستی ناڕاستەوخۆ، ڕاستەوخۆ بۆ گۆلی بەرامبەر لێدرا ئەوا هەڵدانی گۆل دەژمێردرێت.

- ئەگەر لێدانی سەربەستی ناڕاستەوخۆ، ڕاستەوخۆ بۆ گۆلی تیپەکەی خۆیان لێدرا، ئەوا لێدانی گۆشە دەدرێتە تیپی بەرامبەر.

**کارە پێویستەکان: Procedure**

بۆ هەردوو لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆ و لێدانی سەربەستی ناڕاستەوخۆ تۆپ دەبێت جێگیر بێت کاتێك لێدانەکە جێ بەجێدەکرێت.

لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆی کە دەست پێ دەکات بە شەشەمین هەڵەی کەڵەکەبوو بۆ هەر تیپێك:

- ئەویاریزانەی لێدانەکە جێ بە جێدەکات تۆپ لێبدات بە نیازی گۆل تۆمارکردن وە ناتوانێت تۆپەکە پاس بدات بۆ هاورێیەکانی.
- کاتێك لێدانەکە جێ بەجێدەکرێت، هیچ یاریزانێك ناتوانێت تۆپەکە بگرێت تاوەکو بەر گۆلچی تیپی بەرگریکار نەکەوێت، یا هەڵبگەڕێتەوە لە یەك لەستونەکانی گۆل یا ڕاجە، یا بکەوێتە دەرەوەی یاریگا.
- ئەگەر یاریزانێك هەڵەی کەڵەکەبووی شەشەمی تیپەکەی ئەنجامدا لە نیوە یاریگای تیپی بەرامبەر یا نیوەیاریگای خۆی لە نزیك هێڵی ناوەڕاست وە نزیك بێت لە هێڵی خەیاڵی خاڵی سزای دووەم کە تەریبە بە هێڵی ناوەڕاست، لێدانی سەربەخۆ لە خاڵی سزای دووەم جێ بەجێدەکرێت.
- ئەگەر یاریزانێك هەڵەی کەڵەکەبووی شەشەمی تیپەکەی ئەنجامدا لە نیوە یاریگای خۆی لە نێوان هێڵی خەیاڵی (١٠م) و هێڵی گۆل بەڵام لەدەرەوەی ناوچەی سزا ، ئەوا تیپی هێرشبەر بڕیار دەدا لێدانەکە لە کوێ جێ بەجێدەکا لە خاڵی سزای دووەم یا لەو شوێنەی کە سەرپێچی یەکەی تێدا ڕوویداوە.
- بەدەستپێکردنی هەڵەی کەڵەکەبووی شەشەم کات زیاددەکرێت بۆ ڕێگادان بە جێ بەجێکردنی لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆلە کۆتایی هەر گێمێك یا لە کۆتایی هەر ماوەیەك لە کاتی زیادکراو.

سەرپێچی کردن کاتی دەست پێکردنی هەڵەی کەڵەکەبوو دوای فیکە لێدان وە پێش ئەوەی تۆپ بکەوێتەیاری

| | ئەنجامی لێدانەکە | |
|---|---|---|
| سەرپێچیکاران | گۆل | گۆل نیە |
| یاریزانی هێرشبەر | لێدانی ڕاستەوخۆکە دووبارەدەبێتەوە | لێدانی ناڕاستەوخۆ |
| لێدانەکەبۆگۆل لێنەدرێت | — | لێدانی ناڕاستەوخۆ |
| لەلایەن یاریزانێکی نەناسراو لێدەدرێت | لێدانی ناڕاستەوخۆ | لێدانی ناڕاستەوخۆ |
| یاریزانی بەرگری | گۆل | لێدانی ڕاستەوخۆکە دووبارەدەبێتەوە |
| لەلایەن هەردوو تیپ | لێدانی ڕاستەوخۆکە دووبارەدەبێتەوە | لێدانی ڕاستەوخۆکە دووبارەدەبێتەوە |

تێبینی:

- ئەگەر هاتوو (٥) یاریزان بەرامبەر (٤) یاریزان بوو وە ئەگەر ئەو تیپەی ژمارەی یاریزانەکانی زیاترە گۆڵ تۆمار بکات ، تیپەکەی تر دەتوانێت یاریزانێك بنێرێتە ژوورەوە.
- ئەگەر هاتوو ژمارەی هەردوو تیپ (٤) یاریزان بێت ئەو ناتوانێت هیچ یاریزانێك زیاد بکات.
- ئەگەر هاتوو (٥) یاریزان بەرامبەر (٣) یان (٤) یاریزان یاریان کرد وە ئەو تیپەی کە بە (٣) یاریزان یاری دەکات دەتوانێت تەنها یەك یاریزان بنێرێتە ژوورەوە.
- ئەگەر هاتوو هەردوو تیپ ژمارەی یاریزانەکانیان (٣) یاریزان بێت وە گۆڵ تۆمارکرا ئەوا ناتوانن یاریزان زیاد بکەن.
- ئەگەر هاتوو ئەو تیپەی ژمارەی یاریزانەکانی کەمتر بێت گۆڵ تۆمار بکات یاریەکە بەردەوام دەبێت و ژمارەی یاریزانەکان ناگۆرێت.

– لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆ یان نا ڕاستەوخۆ/ پێویستە لە کاتی جێ بە جێکردنی لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆ یان نارستەوخۆ تۆپەکە جێگیر بێت وە هەمان یاریزان ناتوانێت جارێکی تر یاری بە تۆپ بکاتەوە تاکو بەر یاریزانێکی تر نەکەوێت.

## یاسای چواردەم / لێدانی سزا :- THE PENALTY KICK

لێدانی سزا هەژمار دەکرێت دژی تیپێك ئەگەر یەکێ لەو دە سەرپێچیانە ئەنجام بدات کە شایستەی لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆ بێت لە ناو ناوچەی سزای خۆی کاتێك تۆپ لە یاری بێت.

دەتوانرێت ڕاستەوخۆ گۆڵ لە لێدانی سزا تۆمار بکرێت.

کات زیاد دەکرێت بۆ جێ بە جێ کردنی لێدانی سزا لە کۆتایی گێمەکانی یاری و گێمەکانی کاتی زیاد کراو.




### شوێنی تۆپ و یاریزانەکان : Position of the ball and the players

**تۆپ:** The ball

لەسەر خاڵی سزا دادەنرێت.

**یاریزانی لێدەری سزا:** The player taking the penalty kick

دەبێت بە شێوەیەکی دروست دیاری بکرێت.

### گۆڵچی تیپی بەرگری: The defending goalkeeper

پێویستە لەسەر هێڵی گۆلی خۆی بێت لە نێوان هەردوو ستوونی گۆڵ بەرامبەر یاریزانی لێدەر تا تۆپەکە لێدەدرێت.

### شوێنی گشت یاریزانەکانی تر تەنها یاریزانی لێدەر نەبێت: The players other than the kicker must be located

- لە ناو یاریگا بن.
- لە دەرەوەی ناوچەی سزا بن.
- لە پشت خالی سزا بن.
- پێویستە (٥) پێنج مەتر لە خاڵی سزا دووربن.

### کارە پێویستەکان : Procedure

- ❖ دوای ئەوەی گشت یاریزانەکان شوێنی خۆیان گرت بە گوێرەی ئەم یاسایە، یەك لە ناوبژیوانەکان فیکە
- ❖ .لێدەدات بۆ جێبەجێکردنی سزاکە.
- ❖ ئەو یاریزانەی لێدانی سزاکە جێبەجێ دەکات پێویستە تۆپەکە بۆ پێشەوە لێبدات.
- ❖ تۆپ دەکەوێتە یاری کردن کاتێك بۆ پێشەوەلێدەدرێت یان دەجولێت.

لە کاتی جێ بەجێکردنی لێدانی سزا لە کاتی یاسایی یاری یان لە کاتی درێژکردنەوەی ماوەی یاری لە کۆتایی گێمی یەکەم یان لەکۆتایی ماوەی تەواوی یاری یان لەکۆتایی گێمی زیادکراو بە مەبەستی جێ بەجێکردنی لێدانی سزا یا دووبارەکردنەوەی لێدانەکە ،گۆل دەژمێردرێت، ئەگەر پێش تێپەربوونی لە نێوان هەردوو ئەستوون و لە ژێر راجە (**عارضة**):

تۆپ بەر یەکێ لە ئەستوونەکان یان هەردووکیان بکەوێت یان بەر راجە (**عارضة**) یان بەر گۆڵچی بکەوێت ئینجا بکەوێتە گۆڵ.



### سەرپێچیەکان و سزاکان : Infringements and sanctions

#### ئەگەر یاریزانی لێدەری سزا تۆپەکەی بۆ پێشەوە لێ نەدا:

ناوبژیوان یاریەکە دەوەستێنێ، پاشان فەرمان دەدات یاریەکە دەست پێ بکاتەوە بە لێدانی ناڕاستەوخۆ بۆ تیپی بەرگریکەر، وە جێ بەجێ دەکرێت لە سەر خالی سزا.

**ئەگەر، کاتێك لێدانی سزاکە جێ بەجێ کرا، تۆپ لێدرا لەلایەن هاورێیەکی ئەو یاریزانەی کە دیاریکراوە بۆ لێدانی سزاکە:**

ناوبژیوان یاری دەوەستێنێ، ئاگاداری دەکاتەوە(کارتی زەرد) بەهۆی ئەو رەوشتە ناوەرزشیەی، وە فەرمان دەدات یاریەکە دەست پێ بکاتەوە بە لێدانی ناراستەوخۆ بۆ تیپی بەرگریکەر، وە جێ بەجێ دەکرێت لە سەر خالی سزا.

**ئەگەر ناوبژیوان ئاماژەیدا بە جێبە جێ کردنی لێدانەکە، وە پێش ئەوەی تۆپ بکەوێتە یاری یەك لەمانەی خوارەوە روویدا:**

**یاریزانێکی هەمان تیپی ئەو یاریزانەی لێدانەکە جێ بەجێ دەکات سەرپێچی لە یاسای یاریدا کرد:**

- ناوبژیوان رێگا دەدات لێدانەکە جێ بە جێ بکرێت.
- ئەگەر تۆپ کەوتە ناوگۆل لێدانەکە دووبارە دەکرێتەوە.
- ئەگەر تۆپ نەکەوتە ناوگۆل، ناوبژیوان یاریەکە دەوەستێنێ، پاشان فەرمان دەدات یاریەکە دەست پێ بکاتەوە بە لێدانی ناراستەوخۆ بۆ تیپی بەرگریکەر، وە جێ بەجێ دەکرێت لەوشوێنەی سەرپێچیەکەی تێدا رووداوە.

**یاریزانێکی تیپی بەرگریکار سەرپێچی لە یاسای یاریدا بکات:**

- ناوبژیوان رێگا دەدات لێدانەکە جێ بە جێ بکرێت.
- ئەگەر تۆپ کەوتە ناوگۆل، گۆلەکە هەژمار دەکرێت.
- ئەگەر تۆپ نەکەوتە ناوگۆل، لێدانەکە دووبارە دەکرێتەوە.

**یەك یاریزان یا زیاتر لەتیپی بەرگریکار، وەیەك یاریزان یا زیاتر لە تیپی هێرشبەر، سەرپێچی لە یاسای یاریدا بکەن:**

- لێدانەکە دووبارە دەکرێتەوە.

**ئەگەر: دوای ئەوەی لێدانی سزاکە جێ بەجێ کرا:**

**یاریزانی لێدەر دووبارە تۆپی بەرکەوتەوە( جگە لەبەدەستەکانی ) پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت:**

- لێدانی ناراستەوخۆ هەژماردەکرێت بۆ تیپی بەرامبەر ، وە جێ بەجێ دەکرێت لە شوێنی روودانی سەرپێچی یەکە.

**یاریزانی لێدەر بەئەنقەست دەست لەتۆپیدا، پێش ئەوەی بەریاریزانێکی تر بکەوێت:**

- لێدانی راستەوخۆ هەژماردەکرێت بۆ تیپی بەرامبەر ، وە جێ بەجێ دەکرێت لە شوێنی روودانی سەرپێچی یەکە. وە تیپەکەی سزا دەدرێت بەهەلەیەکی کەلەکەبوو.

**تۆپەکە بەرهۆکارێکی دەرەکی کەوت لەکاتی رۆیشتنی ( جولانەوەی ) بۆ پێشەوە:**

- لێدانەکە دووبارە دەبێتەوە.

**تۆپەکە هەلگەرایەوە ناویاریگا دوای بەرکەوتنی بە گۆلچی، راجە یان ستوونەکان ئە نجا بەر هۆکارێکی دەرەکی کەوت:**

- ناوبژیوان یاری دەوەستێنێ.

- یاری دەست پێ دەکاتەوە بە بەردانەوەی تۆپ لەوشوێنەی بەر هۆکارە دەرەکیەکە کەوتووە ئەگەر لەدەرەوەی ناوچەی سزادا بوو، بەلام ئەگەر لەناوناوچەی سزادا بوو لەم کاتان ناوبژیوان تۆپ بەردەداتەوە لەسەر هێلی ناوچەی سزا لەنزیکترین خال لەو شوێنەی کەتۆپ بەرهۆکارە دەرەکیەکە کەوتووە.

**تۆپەکە تەقی یا لەکەلك کەوت کاتێك کەوتە یاری، وەپێش ئەمەی بەر ستوونەکان، راجە یا یاریزانەکان نەکەوتبێ:**

- لێدانەکە دووبارە دەبێتەوە.

## یاسای پازدەهەم / لێدانی ناردنەژوورەوە :- THE KICK-IN

لێدانی ناردنە ژوورەوە رێگایەکە بۆ دووبارە دەستپێکردنەوەی یاری.

لێدانی ناردنە ژوورەوە دەدرێتە بەرامبەری ئەویاریزانەی کە دوایین کەس بوە تۆپی بەرکەوتوە،کە تۆپەکە هەمووی بە تەواوی لەسەر هێلی تەنیشت تێپەڕیوە لەسەر زەوی یا لەهەوا، یابەر بن میچی (سقف) یاریگا کەوتووە.لە لێدانی ناردنەژوورەوە راستەوخۆ گۆڵ تۆمار ناکرێت.

### شوێنی یاریزانەکان: Position of the players

- لەناو یاریگە.
- لە ماوەی کەمتر نەبن لە (٥م) لە شوێنی هێلی بەرکەوتن (تەنیشت) تاوەکو لێدانی ناردنە ژوورەوەکە جێ بەجێدەکرێت.




### کارە پێویستەکان: Procedure

یەك جۆر رێ و شوێن گرتنە بەر هەیە.

لێدانی ناردنە ژوورەوە.

### شوێنی لێدانی ناردنە ژوورەوە: Position of kick-in

### لەساتی پێدانی تۆپ ، لێدەرەکە:

- یەك پێ ی لەسەر هێلی بەرکەوتن (تەنیشت) ، یا لەسەر زەوی لەدەرەوەی یاریگا بێت.

- تۆپ لێبدات،کە دەبێت جێگیر بێت یا لەو خاڵەی کەوا یاریگەی لێ بەجێهێشتوە( لێی چووەتە دەرەوە)،یا لەسەر زەوی بێت لەدەرەوەی یاریگا کە لەماوەی زیاتر نەبێت لە (٢٥ سم) لەو خاڵەی کە تێیدا چووەتە دەرەوە.
- تۆپەکە لە ماوەی (٤ چرکە) ئامادە بکات بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە.

تۆپ دەکەوێتە یاری کاتێك دەچێتە ناویاریگا.

**سەرپێچیەکان و سزاکان:** Infringements and sanctions

ئەگەر- لەو کاتەی لێدانی ناردنە ژوورەوە جێبەجێکرا، یەك لەیاریزانانی تیپی بەرامبەر نزیکتر بوو لەتۆپ لەو ماوەی کە دیاری کراوە:

- لێدانی ناردنەژوورەوە دووبارەدەکرێتەوە لە لایەن هەمان تیپ وە یاریزانی سەرپێچیکار ئاگادار دەکرێتەوە(کارتی زەرد)، ئەگەر هاتوو پێدانی هەلی سود وەرگرتن جێ بەجێنەکرا، یا یەك لەو هەلانەی کە سزاکەی لێدانی سەربەخۆیە یا لێدانی سزایە ئەنجام نەدرا لەلایەن تیپی بەرامبەر بۆئەوتیپەی کە لێدانی ناردنە ژوورەوە جێ بەجێدەکات.

ئەگەر یەك لەیاریزانانی بەرامبەر بە شێوەیەکی نادادپەروەرانە هۆشیاری یاریزانی لێدەر تێکبدا یا تەگەرەی بخاتە بەر لەکاتی لێدانی ناردنە ژوورەوە:

- ئاگادار دەکرێتەوە بەهۆی ڕەوشتی ناوەرزشی یەوە.

بۆڕوودانی هەر سەرپێچیەکی تر لە ڕێگاکانی جێبەجێکردنی لێدانی ناردنە ژوورەوە:

- لێدانی ناردنە ژوورەوە جێ بەجێدەکرێت لە ڕێی یاریزانێکی تر لە تیپی بەرامبەر.

لێدانی ناردنە ژوورەوەی جێ بەجێدەکرێت لەلایەن یاریزانێك جگە لە گۆلچی:

ئەگەر تۆپ کەوتە یاری وە ئەویاریزانەی لێدانەکەی جێ بەجێکردووە دووبارەتۆپی بەر بکەوێت ( بێجگە لە بەرکەوتنی بە دەستەکانی) وە پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت:

- لێدانی ناڕاستەوخۆ دەدرێت بەتیپی بەرامبەر، وە جێ بە جێدەکرێت لەو شوێنەی کە سەرپێچیەکەی تیادا ڕوودلوە.

ئەگەر تۆپ کەوتە یاری وە ئەویاریزانەی لێدانەکەی جێ بەجێکردووە بە ئەنقەست دەستی لە تۆپدا وە پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت:

- لێدانی ڕاستەوخۆ دەدرێت بەتیپی بەرامبەر، وە جێ بە جێدەکرێت لەو شوێنەی کە سەرپێچیەکەی تیادا ڕوودلوە، وە تیپەکەشی سزادەدرێت بە هەڵەیەکی کەڵەکەبوو.
- لێدانی سزا دەدرێت بە تیپی بەرامبەر ئەگەر سەرپێچی یەکە ئەنجامدرا لەناو ناوچەی سزای ئەو یاریزانەی کەوا لێدانی ناردنە ژوورەوەی جێ بەجێکردووە، وە تیپەکەشی سزادەدرێت بە هەڵەیەکی کەڵەکەبوو.

لێدانی ناردنە ژوورەوەی جێ بە جێدەکرێت لە لایەن گۆلچی:

ئەگەر تۆپ کەوتە یاری وە گۆلچی دووبارە تۆپی بەر بکەوێت ( بێجگە لە بەرکەوتنی بە دەستەکانی) وە پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت:

- لێدانی ناڕاستەوخۆ دەدرێت بەتیپی بەرامبەر، وە جێ بە جێدەکرێت لەو شوێنەی کە سەرپێچی یەکەی تیادا ڕوویداوە.

ئەگەر تۆپ کەوتە یاری وە گۆلچی بە ئەنقەست دەستی لە تۆپدا پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت:

- لێدانی ڕاستەوخۆ دەدرێت بەتیپی بەرامبەرئەگەر سەرپێچی یەکە لەدەرەوەی ناوچەی سزای گۆلچیەکە ڕوویدا، وە جێ بە جێدەکرێت لەو شوێنەی کە سەرپێچیەکەی تیادا ڕوویداوە،وە تیپەکەشی سزا دەدرێت بە هەڵەیەکی کەڵەکەبوو.
- لێدانی ناڕاستەوخۆ دەدرێت بە تیپی بەرامبەر ئەگەر سەرپێچی یەکە لەناو ناوچەی سزای گۆلچیەکە ڕوویدا ، وە جێ بەجێدەکرێت لەسەر هێڵی ناوچەی سزا لە نزیکترین خاڵ لە شوێنی ڕوودانی سەرپێچی یەکە.

## یاسای شازدەهەم / هەڵدانی گۆڵ:- THE GOAL CLEARANCE

هەڵدانی گۆڵ ڕێگایەکە بۆ دووبارەدەست پێکردنەوەی یاری.

هەڵدانی گۆڵ هەژمار دەکرێت کاتێك تۆپەکە هەمووی بە تەواوی بەسەر هێڵی گۆڵ تێپەر دەبێت لەسەر زەوی یان لە هەوا ، وە دوایین جار بەر یاریزانێکی تیپی هێرشبەر کەوتبێت، وە گۆڵی تیا تۆمار نەکرابێت بە گوێرەی بەندەکانی یاسای (١٠).

ناتوانرێت لە هەڵدانی گۆڵ ڕاستەوخۆ گۆڵ تۆمار بکرێت.

### شوێنی یاریزانەکان: Position of the players

دەبێت یاریزانانی تیپی بەرامبەر:

لەناویاریگا بن وە لەدەرەوەی ناوچەی سزای ئەو تیپەی هەڵدانی گۆل جێ بە جێدەکات تاوەکو تۆپەکە دەکەوێتە یاری.



**کارە پێویستەکان: Procedure**

- تۆپەکە هەڵدەدرێت لە هەر خاڵێك لە ناو ناوچەی سزا لە رێگەی گۆڵچی تیپی بەرگریکار.
- گۆلچی تیپی بەرگریکار هەلدانی گۆلەکە جیٰ بە جێدەکات لە ماوەی چوار چرکە، لەوکاتەی کە ئامادە دەبێت بۆهەڵدان.
- تۆپەکە دەکەوێتە یاری کاتێك ڕاستەوخۆ هەڵدەدرێتە دەرەوەی ناوچەی سزا لە لایەن گۆلچی تیپی بەرگریکار..

**سەرپێچیەکان و سزاکان: Infringements and sanctions**

ئەگەر تۆپەکە ڕاستەوخۆ هەلنەدرایە دەرەوەی ناوچەی سزا لە هەلدانی گۆل:

- هەلدانەکە دووبارە دەبێتەوە، بەلام ژماردنی چوار چرکە نویٰ نابێتەوە، وەبەردەوام دەبێت لەوکاتەی گۆلچی ئامادە دەبێت بۆ دووبارە کردنەوەی.

ئەگەر تۆپەکە کەوتە یاری وە گۆلچی دووبارە بەری کەوتەوە (جگە لەبەرکەوتنی دەستەکانی) وە پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی بەرامبەر بکەوێت ( جگە لەبەر کەوتنێکی لەناکاوی یەك لەیاریزانەکانی تیپەکەی):

- لێدانێکی ناڕاستەوخۆ دەدرێتە تیپی بەرامبەر، وە جیٰ بەجێدەکرێت لەو شوێنەی کە سەرپێچی یەکەی تێدا ڕوویداوە.

ئەگەر تۆپەکە کەوتە یاری وە گۆلچی بە ئەنقەست دەستی لەتۆپەکەدا، پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت:

- لێدانێکی ڕاستەوخۆ دەدرێتە تیپی بەرامبەر، ئەگەر سەرپێچی یەکە لەدەرەوەی ناوچەی سزای گۆلچی یەکە ڕوویدا، وە جیٰ بەجێدەکرێت لەو شوێنەی کە سەرپێچی یەکەی تێدا ڕوویداوە، وەتیپەکەی سزا دەدرێت بە هەلەیەکی کەلەکەبوو.
- لێدانێکی ناڕاستەوخۆ دەدرێتە تیپی بەرامبەر، ئەگەر سەرپێچی یەکە لەناو ناوچەی سزای گۆلچی یەکە ڕوویدا، وە جیٰ بەجێدەکرێت لە سەر هێلی ناوچەی سزا لە نزیکترین خالٰ لەو شوێنەی کە سەرپێچی یەکەی تێدا ڕوویداوە.

ئەگەر هەلدانی گۆلەکە لەماوەی چوار چرکەدا جیٰ بەجێنەکرا:

- لێدانێکی ناڕاستەوخۆ دەدرێتە تیپی بەرامبەر، وە جیٰ بەجێدەکرێت لە سەر هێلی ناوچەی سزا لە نزیکترین خالٰ لەو شوێنەی کە سەرپێچی یەکەی تێدا ڕوویداوە.

ئەگەر هەلدانی گۆلەکە جیٰ بەجێکرا لەو کاتە هێرشبەرێك لەناو ناوچەی سزادا بوو:

- هەلدانەکە دووبارە دەکرێتەوە ئەگەر تۆپ بەر هەر یاریزانێکی هێرشبەر بکەوێت، یا نەهێلێت هەلدانەکە بە شێوەیەکی دروست جیٰ بەجێبکرێت.

له کاتی ڕوودانی هەرسەرپێچی یەکی تر لەم یاسایەدا:

- هەلدانی گۆلەکە دووبارە دەکرێتەوە، ئەگەر سەرپێچی یەکە ئەنجامدرا لە لایەن ئەوتیپەی کە هەلدانەکە جیّ بە جێدەکات، ئەوا ژماردنی چوار چرکە نویّ نابێتەوە، بەلکو بەردەوام دەبێت لەوکاتەی گۆلچی ئامادە دەبێت بۆ دووبارە کردنەوەی.

## یاسای حەڤدەهەم / لێدانی گۆشە :- THE CORNER KICK

لێدانی گۆشە ڕێگایەکە بۆ دووبارە دەست پێکردنەوەی یاری.

لێدانی گۆشە هەژمار دەکرێت کاتێك تۆپەکە هەمووی بە تەواوی بەسەر هێڵی گۆلّ تێپەر دەبێت لەسەر زەوی یان لە هەوا ، وە دوایین جار بەر یاریزانێکی تیپی بەرگریکار کەوتبێت، وە گۆڵی تیا تۆمار نەکرابێت بە گوێرەی بەندەکانی یاسای (١٠).

دەتوانرێت ڕاستەوخۆ لە لێدانی گۆشە گۆلّ تۆمار بکرێت، بەلام تەنها دژی تیپی بەرامبەر.

### شوێنی تۆپ و یاریزانەکان : Position of the ball and the players

تۆپ دەبێت:

- لە ناو کەوانەی گۆشە دابنرێت، لە نزیکترین خالّ لەو شوێنەی کە تۆپەکە هێلی گۆلی بریە( لیّ ی چووەتە دەرەوە).

یاریزانانی بەرامبەر دەبێت:

- لەناو یاریگا بن لە ماوەی کەمتر نەبن لە (٥م) لە کەوانەی گۆشە تاوەکو تۆپەکە دەکەوێتە یاری.

### کارە پێویستەکان : Procedure

- دەبێت لێدانەکە جیّ بە جیّ بکرێت لەلایەن یەکیّ لە یاریزانانی تیپی هێرشبەر.
- ئەوتیپەی لێدانەکەی پیّ دەدرێت دەبێت تۆپەکە ئامادە بکات لەماوەی چوار چرکە بۆ جیّ بەجێکردن.
- تۆپەکە دەکەوێتەیاری کاتی لێدانی یان جولاّندنی.





**سەرپێچییەکان و سزاکان:** Infringements and sanctions

ئەگەر لێدانی گۆشە جێ بەجێکرا وە یەکێك لە یاریزانانی تیپی بەرامبەر نزیکتر بوو لە تۆپ لە ماوەی دیاریکراو:

- لێدانەکە دووبارە دەبێتەوە لە لایەن هەمان تیپ، وە یاریزانی سەرپێچیکار ئاگادار دەکرێتەوە ( بەکارتی زەرد) ئەگەر هاتوو پێدانی هەلی سود وەرگرتن جێ بەجێنەکرا، یا یەك لەو هەلانەی کە سزاکەی لێدانی سەربەخۆیە یا لێدانی سزایە ئەنجام نەدرا لەلایەن تیپی بەرگریکار.

ئەگەر یەك لەیاریزانانی بەرامبەر بە شێوەیەکی نادادپەروەرانە هۆشیاری یاریزانی لێدەر تێکبدا یا تەگەرەی بخاتە بەر لەکاتی لێدانی گۆشە:

- ئاگادار دەکرێتەوە بەهۆی ڕەوشتی ناوەرزشی یەوە.

ئەگەر لێدانی گۆشەکە جێ بەجێنەکرا لە ماوەی چوار چرکە:

- هەلدانی گۆل دەدرێتە تیپی بەرامبەر.

لە کاتی ڕوودانی هەر سەرپێچی یەکی تر لە ڕێ و شوێنی جێ بەجێکردن یان لە شوێنی تۆپەکە:

- لێدانەکە دووبارە دەکرێتەوە، ئەگەر سەرپێچی یەکە ئەنجامدرا لە لایەن ئەوتیپەی کە لێدانەکە جێ بە جێدەکات، ئەوا ژماردنی چوار چرکە نوێ نابێتەوە، بەلکو بەردەوام دەبێت لەوکاتەی یاریزانی لێدەر ئامادە دەبێت بۆ دووبارە کردنەوەی لێدانەکە.

لێدانی گۆشەی جێ بەجێدەکرێت لەلایەن یاریزانێك جگە لە گۆلچی:

ئەگەر تۆپ کەوتە یاری وە ئەویاریزانەی لێدانەکەی جێ بەجێکردووە دووبارەتۆپی بەر بکەوێت ( بێجگە لە بەرکەوتنی بە دەستەکانی) وە پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت:

- لێدانی ناڕاستەوخۆ دەدرێت بەتیپی بەرامبەر، وە جێ بە جێدەکرێت لەو شوێنەی کە سەرپێچییەکەی تیادا ڕوویداوە.

ئەگەر تۆپ کەوتە یاری وە ئەویاریزانەی لێدانەکەی جێ بەجێکردووە بە ئەنقەست دەستی لە تۆپدا وە پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت:

- لێدانی ڕاستەوخۆ دەدرێت بەتیپی بەرامبەر، وە جێ بە جێدەکرێت لەو شوێنەی کە سەرپێچییەکەی تیادا ڕوویداوە وە تیپەکەشی سزادەدرێت بە هەلەیەکی کەلەکەبوو.
- لێدانی سزا دەدرێت بە تیپی بەرامبەر ئەگەر سەرپێچی یەکە ئەنجامدرا لەناو ناوچەی سزای ئەو یاریزانەی کەوا لێدانەکەی جێ بەجێکردووە، وە تیپەکەشی سزادەدرێت بە هەلەیەکی کەلەکەبوو.

لێدانی گۆشەی جێ بە جێدەکرێت لە لایەن گۆلچی:

ئەگەر تۆپ کەوتە یاری وە گۆلچی دووبارە تۆپی بەر بکەوێت ( بێجگە لە بەرکەوتنی بە دەستەکانی) وە پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت:

- لێدانی ناڕاستەوخۆ دەدرێت بەتیپی بەرامبەر، وە جێ بە جێدەکرێت لەو شوێنەی کە سەرپێچی یەکەی تیادا ڕوودا‌وە.

ئەگەر تۆپ کەوتە یاری وە گۆلچی بە ئەنقەست دەستی لە تۆپدا پێش ئەوەی بەر یاریزانێکی تر بکەوێت:

- لێدانی ڕاستەوخۆ دەدرێت بەتیپی بەرامبەرئەگەر سەرپێچی یەکە لەدەرەوەی ناوچەی سزای گۆلچیەکە ڕوویدا، وە جێ بە جێدەکرێت لەو شوێنەی کە سەرپێچی یەکەی تیادا ڕوودا‌وە، وە تیپەکەشی سزادەدرێت بە هەلەیەکی کەلەکەبوو.
- لێدانی ناڕاستەوخۆ دەدرێت بە تیپی بەرامبەر ئەگەر سەرپێچی یەکە لەناو ناوچەی سزای گۆلچیەکە ڕوویدا ، وە جێ بەجێدەکرێت لەسەر هێلی ناوچەی سزا لە نزیکترین خال لە شوێنی ڕوودانی سەرپێچی یەکە.

## لێدانەکانی خاڵی سزا:

جێ بەجێ کردنی لێدانەکان لە خاڵی سزا ڕێگایەکە بۆ دەست نیشان کردنی تیپی براوە کاتێك یاری یەکە یەکسان بێت ئەگەر ڕێنمایی خولەکە داوای کردبێت تیپی براوە دیار بکرێت لەو یاریانەی کۆتاییان دێت بە بەرامبەر بوون.

## کارە پێویستەکان:

- ناوبژیوان یەکێ لە گۆڵەکان دەست نیشان دەکات بۆ جێ بەجێ کردنی لێدانەکان.
- ناوبژیوان تیروپشك ئەنجام دەدات بە هۆی پارچە پارەیەکی کانزا وە ئەو تیپەی سەرۆکەکەی (کاپتنی) لە تیرو پشك بباتەوە لێدانی یەکەم جێ بەجێ دەکات یا لێدانی دووەم.
- ناوبژیوان و ناوبژیوانی دووەم وە ناوبژیوانی سێ یەم وە کاتگر پارێزگاری دەکەن لە تۆماری لێدانەکانی کە جێ بەجێدەکرێن .
- هەر تیپێك (٣) سێ لێدان جێ بەجێ دەکات.
- لێدانەکان بە نۆبە (تناوب) لە نێوان هەردوو تیپ جێ بەجێ دەکرێت.
- ئەگەر پێش ئەوەی تیپەکان پێنج لێدان جێ بەجێبکەن، یەك لە تیپەکان گۆلی زیاتری تۆمارکردبوو وەئەوەی تریان نەی دەگەیشتێ ئەگەر هەر پێنج لێدانەکەش تەواو بکات ئەوا هیچ لێدانێکی تر جێ بەجێناکرێت.
- ئەگەر تیپەکان (٣) سێ لێدانەکانیان تەواو کرد وە گۆڵیان وەکو یەك تۆمار کردبوو یان هیچ گۆڵیان تۆمار نەکردبێت ، ئەوا یاریەکە بەردەوام بە هەمان ڕێگە تاکو تیپێك گۆڵ زیاتر تۆمار دەکات لە تیپەکەی تر بە مەرجێك ژمارەی لێدانەکانی هەردوو تیپ وەك یەك بێت.
- هەموو یاریزانان و یاریزانانی یەدەگ دەتوانن لێدانەکانی سزا جێ بەجێبکەن.
- گۆلچی دەتواندرێت جێگای بگۆردرێت لەگەل هەریاریزانێك لە کاتی جێ بەجێکردنی لێدانەکان لە خالی سزا.

- هەر لێدانێك لەلایەن یاریزانێكی جیاواز لێدەدرێت وەهەموو یاریزانەكانی كە مافی لێدانیان هەیە دەبێت لێدانەكە جێ بەجێبكەن پێش ئەوەی یاریزانێكی تر بۆ دووەمجار لێ ی بداتەوە.
- تەنها ئەو یاریزانانەی كە مافی لێدانیان هەیە كە گۆلچیەكانیش دەگرێتەوە، لە گەل ناوبژیوانان و ناوبژیوانی سێ یەم بۆیان هەیە لەناو یاریگادا بمێننەوە لە كاتی جێ بەجێكردنی لێدانەكان لە خالی سزا.
- گشت ئەو یاریزانانەی كە مافی لێدانیان هەیە، بێجگە لەو یاریزانەی كە لێدانەكە جێ بەجێدەكات لەگەل هەردوو گۆلچی دەبێت لەنیوە یاریگاكەی تر بمێننەوە لەگەل ناوبژیوانی سێ یەم.
- ئەو گۆلچی یەی كە هاوڕێی جێ بەجێكەری لێدانەكەیە دەبێت بمێنێتەوە لەناو یاریگا لەبەرامبەر ناوچەی هونەری وەلەئاستی خالی سزا وەكەمتر نەبێت لە ماوەی (٥م).
- ئەگەر لەكۆتایی یاری یا كۆتایی گێمی زیادكراو پێش دەستپێكردنی لێدانەكان لە خالی سزا یەك لەتیپەكان ژمارەی یاریزانەكانی زیاتر بوو بە یاریزانانی یەدەگیشەوە لە تیپی بەرامبەر دەبێت ژمارەی كەم بكاتەوەو یەكسانی بكات لەگەل تیپی بەرامبەر، دەبێت كاپتنی تیپ ناوبژیوان ئاگادار بكاتەوە لە ناوو ژمارەی ئەویاریزانەی كە دوور دەخرێتەوە.

## شوێنی ناوبژیوانەكان و یاریزانەكان و گۆلچیەكان كاتی جێ بەجێكردنی لێدانەكان لە خالی سزا:



## پرسیار و راهێنان

پ١/ درێژییەکانی گۆرەپانی یاری فوتساڵ چەندە؟

پێویستە گۆرەپانی یاری لەسەر شێوەی لاکێشە بێت .. درێژی هێڵی بەرکەوتە (التماس) لە هێڵی گۆڵ گەورەتربێ .. درێژی و پانیەکان بەم شێوەیە دەبێت :

درێژییەکانی ..... کەمترین درێژی ٢٥م

درێژترین درێژی ٤٢م

پانیەکان ........ کەمترین درێژی ١٠م

درێژترین درێژی ٢٥م

*بەڵام بۆ یارییە نێو دەوڵەتیەکان ، ئەم درێژییانە پەیرەو دەکرێت ...

درێژییەکان ...... کەمترین درێژی ٣٨م

درێژترین درێژی ٤٢م

پانیەکان ......... کەمترین درێژی ١٨م

درێژترین درێژی ٢٥م

پ٢/ دووری خاڵی لێدانی سزا لە هێڵی گۆل چەندە ؟

– نیشانەی خاڵی لێدانی هێڵی سزا لە ناوەڕاست بە یەکسانی لەگەڵ هەردوو ستوونی گۆڵ بە (٦) مەتر دوورە .

پ٣/ دووری خاڵی لێدانی سزای دووەم لە هێڵی گۆڵ چەندە ؟

– نیشانەی خاڵی لێدانی سزای دووەم لە ناوەڕاست بە یەکسانی لەگەڵ هەردوو ستوونی گۆڵ بە (١٠) مەتر دوورە.

پ٤/ سیفەتەکانی تۆپی بەکارهاتوو لەم یارییەدا چین ؟

– پێویستە تۆپەکە ئەم سیفەتانەی تیایدا بەدی بکرێت :

- خڕبێت .
- لە پێست یان لەهەر ماددەیەکی شایستە دورست کرابێت .
- چێوەی بازنەی تۆپەکە لە ٦٢ سم کەمتر نەبێت و لە ٦٤ سم زیاتر نەبێت .
- کێشی تۆپەکە لە ٤٤٠گم زیاتر نەبێت و لە ٤٠٠گم کەمتر نەبێت ، لەگەڵ ساتی دەست پێکردنی یارییەکە .
- پاڵە پەستۆی هەوا یەکسان بێت بە (٠,٤ – ٠,٦ ) پاڵەپەستۆی هەوا و (٤٠٠– ٦٠٠) گم /سم$^{2}$ لەسەر ئاستی رووی دەریا .

پ٥/ ژمارەی یاریزانانی بەشداربوو لەهەر تیپێك چەندە؟

– هەر تیپێکی بەشداربوو نابێت لە (٥) یاریزان زیاتر لەنێو یاریگادا یاری بکەن کە یەکێکیان گۆڵچی یە .

پ٦/ سزای هەڵکان و خراپی خووڕەشتی وەرزشی چین ؟

– سزاکان بە گوێرەی هەڵەکان بەم شێوەیە دەژمێردرێت ....

١– لێدانی سەربەخۆی راستەوخۆ .

٢– لێدانی سزا لە خاڵی سزا .

٣- لێدانی سەربەخۆی ناراستەوخۆ .

٤- سزای خورەوشتی ناوەرزشی .

پ٧/ ماوەی یاری کردن لەیاری فوتسالٚ دا چەندە ؟

- یارییەکە بۆ دوو گێمی یەکسان کە (٢٠) دەقیقە بۆ هەر گێمێك دابەش دەکرێت کەسی تایبەت بە کات گرتنەوە پەیوەست دەبێت بە ڕاگرتنی کات لە ساتی وەستانی یاری دا .

پ٨/ کاتی پچڕێنراو ( الوقت المستقطع) لە یارییدا هەیەو چەندە ؟

- بەڵی کاتی پچڕێنراو بۆ هەر تیپێك هەیە و تەنها دەقیقەیەکە بۆ هەر گێمێك بۆ هەر تیپێك .

پ٩/ ماوەی پشووی نێوان هەردوو گێم چەند دەقیقەیە؟

- نابێت ماوەی پشوودان لە نێوان هەردوو گێمی یارییەکە لە (١٥) دەقیقە زیاتر بێت .

پ١٠/ تۆپ لە چ ساتێکدا بە لە دەرەوەی یاریگا دەژمێردرێت ؟

- تۆپ لەم حاڵەتانەی خوارەوە لە دەرەوەی یاریگا دەژمێردرێت .

- گەر تۆپەکە بە تەواوی هێڵی گۆڵ یان هێڵی لاکان (التماس لەسەر زەوی یان لە هەوا ببڕێت) .
- گەر یاری لەلایەن ناوبژیوانی یاری یان ناوبژیوانی دووەم وەستێنرا .
- گەر تۆپەکە بە بن میچی هۆڵەکە کەوت .

پ١١/ بەرزی بنمیچی هۆڵەکە بەلایەنی کەمەوە پێویستە چوند بێت ؟

- پێویست بەرزی بنمیچی هۆڵەکە بەلایەنی کەمەوە لە (٤) مەتر نزم تر نە بێت .

پ١٢/ چۆن هێلی نێو یاریگا دەکێشرێت ، واتایەکی دیکە پانی هێلە کێشراوەکان چەندە؟

- نابێت هێلەکە بە پچڕپچڕکراوی بکێشرێت بەڵکو پێویستە بە شێوەی هێڵی ڕاست بکێشرێت و پانتایی هێلەکەش (٨) سم بێت .

پ١٣/ گەر یاریزانێك ئامادەنەبوو بۆ گۆڕینی بە یاریزانێکی دیکە .. ناوبژیوان لەسەریەتی چی بکات ؟

- ناوبژیوان ڕێگای پیێ دەدات بەردەوام بێت لە یاری کردن .. چونکە لە توانای ناوبژیوان نی یە ناچار بکات ڕەزامەندی لەسەر گۆڕینی بکرێت .

پ١٤/ ئایا گۆڵچی مافی لێدانی لاو لێدانی کوڕنەو و لێدانی سزای هەیە ؟

- بەڵیٚ هەموو ئەم مافانەی هەیە لەبەرئەوەی بەشێکە لە ئەندامانی تیپەکەی .

پ١٥/ ئایا کاپتنی تیپ یان بەرپرسی تیپ دەتوانیٚ یاریزانێکی یان یاریزانێکی جیٚ گۆتەوە بە هۆی سەرپێچی بکاتە دەرەوە کە سەرپێچیەکەی شایانی دەرکردنی بێت ؟

- نەخێر .... تەنها بۆ ناوبژیوان یان ناوبژیوانی دووەم ماف هەیە بڕیاری لەم جۆرە بدات .

پ١٦/ کاری ناوبژیوانی دووەم لە ساتی لێدانی سزا لە شوێنی خاڵی سزا یان لێدانی سەربەستی ڕاستەوخۆی بیٚ هەبوونی دیوار چی یە ؟

- وردبوونەوە لەوەی کە تۆپەکە بە تەواوی هێلی گۆڵی بڕوە یاخود نا ... هەروەها گۆڵچی بۆ ماوەی کەمتر لە (٥) مەتر هاتۆتە پێش .